# بیستو سێ ساڵ سەرووەریی

## وەڵامێك بۆ كتێبی (بیستو سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی)

نووسینی:

ئەحمەد حاجی ڕەشید

دكتۆر صەباح بەرزنجی

پێشەكی بۆ نووسیوە

1428 كۆچی 2007 زایینی

ناوی کتێب: بیستو سیٚ سالٚ سەروەریی، وەلامێك بۆ كتێبی(بیستو سیٚ سالٚ پێغەمبەرایەتی)

نووسینی: ئەحمەد حاجی رەشید

ژمارەی سپاردن: (333) ساڵی (2007) بەرێوەبەرایەتی چاپو بلاوكردنەوە.

شوێنی چاپ: كۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر/07703612141

نۆرەی چاپ: یەكەم

ساڵی چاپ: 2007

تیراژ: **1500**

لە بلاوكراوەكانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (16)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت: www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس‌و ستایشی بیٚ پایان بوٚخودای گەورەو پەروەردگارو دروودو سلاٚوی نەبڕاوە بوٚسەر گیانی پیٚغەمبەری نازداروتیٚکڕای یاوەرانی لەموهاجرین‌و ئەنصار.

برای بەڕیٚزو خوٚشەویستم ماموٚستا ئەحمەد حاجی ڕەشید لە هەستیٚکی ڕوٚشنگەرانەو دڵسوٚزانەوە چاکی لیٚکرد بەلادا‌و وەلاٚمدانەوەی کتیٚبی (بیست وسیٚ ساڵ پیٚغەمبەرایەتی) گرتە ئەستوٚو بەشیٚوەیەکی( سهل ممتنع) دایە بەر نەشتەری لیٚکوٚڵینەوەی ڕەخنەگرانە بە مەبەستی پەردەلادان لەسەر ئەو هەڵە میٚژوویی‌و مەنهەجیانەی نووسەری ئەم کتیٚبە تیٚیان کەوتووەو دەچنە خانەی ئەدەبیاتی خیانەت‌و میٚژووی چەواشەکارییەوە .

دوای ئەوەی بەرهەمەکەیم خویٚندەوە هەستم کرد جەنابیان وەك کەسیٚکی ئاینخواز و شارەزا لە سەرچاوە میٚژووییەکان‌و زاراوە زانستییەکانی کەلتووری ئیسلامی چوەتە مەیدان‌و هوٚن هوٚن برِگەو ڕستەکانی نووسەری شیکردووەتەوەو سەلماندوویەتی ئەم جوٚرە نووسینە بەناو میٚژوویی‌و شیکاریانە، نە بەمەبەستی دەرخستنی ڕاستییەکانی میٚژوو، بەڵکو بە ئامانجی ئاوەژوکردنی ڕاستییەکانی میٚژووەو جگە لەوەی پشتی بەهیچ بنەمایەکی زانستیی‌و دادگەریی نەبەستووە، ئەڵقەیەکیشە لەو هەڵمەتە فیکری‌و ئایدوٚلوٚژییەی دژ بە ئیسلام‌و ئوممەت ئەنجام دەدریٚت .

دەستخوٚشی لەبرای نووسەر دەکەم بوٚ ئەو ماندووبوون‌و هەوڵە روٚشنگەرییەی‌و هیوادارم لەمەولاش قەڵەمەکەی بخاتە گەڕ بوٚ داکوٚکیی لە راستییەکانی ئیسلام‌و سیرەی پڕ لەسەروەریی پیٚغەمبەری نازدار (صەلات‌و سەلامی خوای لەسەربیٚت)، ئەو پیٚغەمبەرەی مروٚڤی کامڵ و هەڵبژاردەیەو سوٚزو بەزەیی خودایە بوٚ گروٚی مروٚڤایەتی بە دریٚژایی زەمین‌و زەمان.

دکتوٚر صەباح بەرزنجی

پروٚفیسوٚری یاریدەدەر لە کوٚلیٚژی زانستە مروٚڤایەتیەکانی زانکوٚی سلیٚمانی

2007/3/24

# پێشەکی

پێشکەوتنی گەلان‌و وڵاتان لە هەر سەردەمێکدا پێوان‌و کێشانەیەکی تایبەتی هەبووەو دەبێت، سەردەم هەبووە سیحرو جادوو پێوانە بوون بۆ ئەو گەلەی کە پێشکەوتووترینیانە، جاری واش هەبووە جۆرەکانی دەرمان‌و چارەسەرکردنی نەخۆشەکان کێشانە بووە، سەردەمیش هەبووە بەهێزیی سوپاو زۆری قەڵای بەرز تاکە مەشخەڵی پێشکەوتن بوون، ئەمڕۆی ئێمەش نەپچڕاو لەو مێژووە دوورو درێژەی مرۆڤایەتی، دەبێت پێوەرێك هەبێت کە نیشانەی پێشکەوتن دیاریی بکات، ئەمانەی پێشەوە هەموویان نیشانەی پێشکەوتنن، بەدەر لە خورافەو سیحرو جادو، بەڵام دەبێت بزانین ئەمانە هەموویان لە کوێوە سەرچاوە دەگرن، خۆ ئەگەر گوزەرێك بکەین بەو خاڵانەی کە باسمان کردن، دەبینین هەریەکەیان جۆرێك لە مەعریفەی تێدا بەدی دەکرێت، مەعریفەش هەستێکی بەدەست هاتووە، واتە (موکتەسەبە)و گەلان لەو پێناوەدا هەوڵی زۆریانداوە لە بواری بەدەستهێنانی مەعریفەدا، تەنانەت دەگێڕنەوە لە سەردەمی عەباسییەکاندا بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە، هەرکەس توانای وەرگێڕانی کتێبێکی زمانەکانی گەلانی دیکەی هەبا، بە ئەندازەی قورسایی کتێبەکە زێڕو زیویان پێ خەڵات دەکرد، کەواتە ئەوەی بە میراتی بۆ ئێمەی ئەم سەردەمە ماوەتەوە، ئەو هەموو مەعریفەیەیە کە لەباوو باپیرانمانەوە بۆمان بەجێماوە، جا هەندێك لە گەلان بەرهەمی نوێیان بۆ زیادکردووەو خۆیان خەریك کردووە بە پراکتیزەکردنی ئەو مەعریفانەوەو پێشکەوتنی بەرچاویان بەخۆیانەوە بینییەوەو هەندێکی وەك گەلانی ئێمەو دەورووبەرمان خەریکبوون بە شتی لاوەکییەوە، ئەوەتا بە ڕاکردنیش ناگەینە پێشکەوتووان‌و ئەوان ناونران وڵاتە پێشکەوتووەکان‌و ئێمەش وڵاتە خەوتووەکان، یان دواکەوتووەکان، بە بڕوای من بنچینەو سەرەتای هەموو پێشکەوتنێك مەعریفەو ڕۆشنبیرییە، کەواتە بوونی یەکەی چاپەمەنی‌و دەرکردنی کتێب‌و گۆڤارو ڕۆژنامە، ڕەهەندە بێ قەیدو شەرتەکانی پێشکەوتنی گەلانە، بە جیاوازی ئایین‌و ڕەگەزو ڕەچەڵەك، هەر بۆیە ئەگەر بەراورد هەبێت دەکرێت بڵێم چاپکراوی هەندێ وڵاتانی پێشکەوتوو لە ڕۆژێکدا بە ئەندازەی ساڵێکی لای ئێمە دەبێت، بۆیە هەر ڕۆژێك بە قەدەر ساڵێکی ئێمە پێشدەکەون‌و ئێمەش پێیان ناگەین. ئەوەی من دەمەوێت بیکەمە پێشەکییەك بۆ ئەم کتێبە ڕەخنەئامێزەی کە دەینووسم ئەوەیە کە لە وکاتەوە کە دنیا هەیە ئاڵۆزی‌و ململانێی لێنەبڕاوەو لێی نابڕێت، بۆ یەکلاکردنی، یان ساغکردنەوەی ئەو ململانێیانە دەبێت پێشبکەوین، ئەویش لە ڕێگەی ڕۆشنبیرکردنەوە دەبێت، ئەگەرنا لە مێژوودا زۆر هەوڵدراوە کە ململانێکان بە ڕێگای زەبری هێز یەکلابکرێنەوە کەمتر سەرکەوتوو بووە، یان لەگەڵ سەرکەوتندا خەسارەتێکی زۆر گەورەیان لە خۆیان‌و بەرامبەرەکانیان داوە، بۆیە ئەم ڕێبازە (نووسین بە نووسین) وەڵامدانەوە، دەچێتە خانەی پێشکەوتوویی میللەت، گەل‌و وڵات پارێزراو دەبن لە ململانێ خوێناوییەکان، بۆیە سەرەتا دەمپرسی ئایا دەکرێت وەختی خۆم بەزایە نەدەم‌و نووسینێك بخوێنمەوە کە هەمووی گەر بڵێم موبالەغە ناکەم درۆو دەلەسەیە، بەڵام چۆن بەخوێنەران بڵێم، ئایا بە قسەی ڕووت‌و بێ بەڵگە بڕوام پێدەکەن، دەکرێت بڵێم ئەوانەی کە دەمناسن باوەڕبکەن، ئەی ئەوانەی کە نامناسن، یان گوێیان لە دەنگم نییە. بۆیە نووسین لەسەر کتێبەکەم هەڵبژاردو دەستمکرد بە خوێندنەوەی‌و هەندێ شتم لا گەڵاڵە بوو، بۆ جاری دووەم وردترو لەسەرخۆتر لە مێشکمدا مەنەلۆجی داخلیی بەرپابوو، تێدەفکرام، لە جاری سێیەمدا دەستمکرد بە دەستنیشانکردنی خاڵە لاوازەکان، پاشان دەستمکرد بە نووسینەوەیان، لە کۆتاجاردا هەستام بەبەرپەرچدانەوەی یەکە یەکە کە لای من جێگەی سەرنج‌و تێڕامانن، ئەو خاڵەشی کە سەرنجم لەسەری هەیە دەقەکەی نەقڵ دەکەم، بە ئەندازەی ئەوەی خوێنەر لێی تێبگات، دەشتوانم بڵێم شتی زۆری تر ماوە کە خەڵکی دوای من پەی پێدەبەن‌و سەرنجیان لە سەری دروست دەبێت، بەمشێوەیە دەستمکرد بە نووسین، سەرەتا بەڕەخنە لەسەر خودی کتێبەکەو پاشان لەسەر نووسەرەکەی، لەدوای ئەوەش لەسەر وەرگێڕو لە کۆتاییدا دەچمە ناو باسەکەوە، هەڵەکانم بەپێی توانای خۆم‌و ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستمدا بوون بەرپەرچدایەوە، بە هیوام نووسینێکی باشم بۆ کتێبخانەی کوردی زیاد کردبێت‌و خشتێکی بچووکم لە پێشکەوتنی وڵاتەکەمدا خستبێتە سەر خشتی خەڵکانی دیکە.

ئەحمەد حاجی ڕەشید

2006–3–25/24

# ڕێخۆشکردن

نووسەری ئەم کتێبە باس لە وەدەکات، چەند ساڵێك بەر لە ڕووداوی ئینقیلابی ئێران‌و هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامیی ئێران کە ناسراوێکی هاتووەو هەواڵێکی بۆ هێناوە کە ڕێی کەوتووەتە شوێنێك تێیدا کۆبوونەوەیەك هەبووە، کۆبوونەوەکان هەفتانە بوون‌و هەر هەفتەیەك هەندێك لە نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێران لە ژن‌و پیاو کۆدەبنەوەو یەکێك لەو ئەندامانەی کە نووسەر باس لە ناوەکەی ناکات، دەڵێت (ناوی نابەم لێرەدا) وانەیەك دەخوێنێت سەبارەت بە ژیانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) لە ژێر ناونیشانی (بیست‌و سێ ساڵ) مامۆستای وانەبێژ هەوڵ دەدات تا پەیامی پێغەمبەر – کە مسوڵمانان باوەڕیان پێیەتی – هەڵبوەشێنێتەوە، ئەم وانانە هەر هەفتەیەك لە چەند کاغەزێکدا دەنووسرێنەوەو لە نێوان ئامادەبووواندا پەخش دەکرێن.

ئەم ڕووداوەش زۆری نەخایەند کە لە ڕێگەی سەفارەتی شاهەنشاهی ئێران لە لوبنان ئەم نووسینە براوەتە بەیروت‌و لەوێ بە چاپیان گەیاندووەو هێناویانەتەوە بۆ تاران‌و بەشێوەیەکی نهێنی دەستیان بەفرۆشتنی کردووە. دەڵێت پاش ئەوەی نوسخەیەکی بەدەستهێنا، زانیم کە پیتەکانی چاپەکە لەو جۆرەیە کە لە لوبنان ڕەواجی هەیەو لە ئێراندا نییە.

کتێبەکە ناونیشانی نووسەری لە سەر نییەو هەروەها لە سەرەتاو کۆتاییشدا چاپخانەکەی لەسەر نییە، وەك هەرکارێکی ئاسایی نووسین.

پاشان لە سەرەتای ئینقیلابدا بازاڕی ئەم کتێبە گەرم بوو، دووبارە لە چاپ درایەوە لە لایەن چەپەکانی لایەنگری ڕووسیەوە.

لە چاپە نوێیەکەدا ناوی (دکتۆر علی نقي منزوي) لەسەر کتێبەکە نووسراوە، کە هەمان کەسە کە کتێبەکەی گلدزیهر (Goldziher)ی ڕۆژهەڵاتناسی جولەکەی وەرگێڕاوە لە ژێر ناونیشانی (چەند وانەیەك لە ئیسلام) "لێرەدا دەمەوێت بڵێم ئەو نووسەرەی کە وەرگێڕە کوردەکەی خۆمان ئاماژەی بۆ دەکات (علی دەشتی)یەو زۆر جیاوازە لە (علی نقي منزوي) کە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەوەشدا خیانەت کراوە، بەهەمان شێوە ناوی کتێبەکە کە (بیست‌و سێ ساڵ)ە، نەك بیست‌و سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی" هەرچەندە ئەم نووسەرە لە چەند ڕۆژنامەیەکدا بێئاگایی خۆی ڕاگەیاند لە نووسینی ئەو کتێبە، لەگەڵ ئەوەشدا شێوازو نووسینی کتێبەکە لەگەڵ نووسینی ئەودا جیاوازیان هەیە، پێش لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە ناوبانگی ڕوو لە زیاد بوون بوو بەتایبەت کە بە قاچاخ دەفرۆشرا.

خۆ ئەگەر بێینە سەر ئەسڵی نووسینی کتێبی (بیست‌و سێ ساڵ) دەبینین کە گیراوەیەکی تێکەڵ لەلادان‌و گۆڕانکارییە لە قورئان‌و تەفسیرو سیرەو مێژوو هەموو ئاینەکان، ترسناکی ئەم کتێبە لەوەدایە کە کەمترینی ئەو کەسانەی دەیخوێننەوە تاقەت‌و حەوسەڵەی ئەوەیان نییە بەدوای سەرچاوە مێژووییەکاندا بگەڕێن، خۆ ئەگەر هەر کەس حەوسەڵەی هەبێت زۆر بەزوویی تێدەگات کە ئەم کتێبە بریتییە لە تێکەڵەیەك لە لادان، هەڵگێڕانەوەی بەڵگەنامە ئیسلامییەکان‌و مێژووی ئیسلام‌و هەروەها درۆسازیی لەبارەی ناوەرۆکی کتێبەکە.

هەندێجار دەقی قورئان‌و تەفسیر گۆڕانکاریی تێدا دەکات، هەروەك لە لا(22) دەنووسێت: "لە وەرگێڕاوەکەدا لا 15، پ5، هاتووە "والرجس فاهجر = واتە واز لە (...) بهێنە".

لەکاتێکدا ئەسڵی ئایەتەکە (وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ = بەواتای لە سزای... خۆت دوور بخەرەوە (ئەمەش وەرگێڕەکەی خۆمان بەڕاستی نەقڵی نەکردووە، هەڵەکەی نووسەری ڕاستکردووەتەوە، وەك شاگردێکی نموونەیی کە هەڵەی مامۆستاکەی ڕاست دەکاتەوە، بە بێئەوەی هیچ ئاماژەیەکی بۆ بکات).

هەروەها درۆیەکی دیکە نەقڵ دەکات کە لە لا(85) هاتووە ".. هەندێ بڕوایان وایە کە کتێبی (الفصول والغايات) أبو العلاء معري بەمەبەستی منافسەو کێبەرکێی قورئان نووسرابێت" ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی سەرکەوتووترینە لە ڕەوانبێژیدا، ئایەتێك، یان بەشێك لە ئایەتێك ڕوونترین وتەیە کە خەڵك لێی تێبگات"[1].

[1] رسالة الغفران، ص472، 473 طبعة ميصر، ص326، طبعة لبنان.

ئەمەو لەکاتێکدا وەرگێڕەکەی خۆمان بەهیچ شێوەیەك باس لەم قسانە ناکات تەنها لە لاپەڕە 22، پ3 باسی مەعری دەکات، شتێکی دیکە دەڵێت.

هەروەها سەبارەت بە تەفسیری ئایەتی (9)ی سورەتی حجرات " وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا " ڕەخنەگر ئاماژە دەکات کە هەرچۆن وشەی (طائفتان) (مثنى)یە دەبێت (أقتلوا)ش مثنى بێت.

لە بوارەکانی زانستو ئەدەبیاتو هونەری تەفسیر کە ڕاستە (طائفتان) (مثنى)یە، بەڵام خەڵکی ئەو دوو تایەفەیە کە جەمعن‌و کۆن، شەڕەکە دەکەن، قورئان لێرەدا مراعاتی واتای کردووە، نەك لەفز، ئەمە نەك هەر پێچەوانەی ئەدەبی عەرەبی نییە، بەڵکو نیشانەی ڕەوانبێژیی قورئانە.

# بەشی یەکەم

زۆرن لە دنیادا ئەوانەی کە نووسەرن‌و کتێب دەنووسن، لەم نێوەندەشدا لەنێو ئەوانەدا نووسەری چاكو بە تواناو ئەکادیمی بەرزو خەڵکانی خاوەن بەهای زانستیی هەن بەهۆی نووسینەکانیانەوە چارەسەری کێشەو گرفتی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی گەل‌و نەتەوەکانیان بەشێوازێکی ڕێکوپێك هەڵدەسەنگێنن‌و لێی ئاگادار دەکەنەوە، یان بە نووسینی بابەتێکی نوێ، فکرێکی نوێ دەخەنە بەردەستی خوێنەران، هەر بۆیە هەندێك لەو نووسەرانە خەڵاتی زێڕین‌و مەدالیای باشترین بەدەستدەهێنن‌و ناوبانگێکی باش‌و سەدایەکی جوان بۆخۆیان‌و گەل‌و هۆزیان تۆمار دەکەن.

لەبەر ئەمانە هەمووی خۆزگە دەکرا سەرجەم ئەو نووسینانەی لە نێو سیاسیی‌و فیکری‌و فەرهەنگی‌و ئەدەبی‌و مێژوودا دەنووسران دەخرانە پێشبڕکێیەکی دادپەروەرانەوەو نووسی کان لە خراپەکان جیا دەکرانەوەو هەمووان ئاستی بەرزی‌و نزمی نووسینەکانیان وەردەگرت، بۆ ئەوەی ئەوانەی چاك دەنووسن زیاتریان نووسیباو ئەوانەش کە خراپ دەنووسن‌و کاتی خوێنەر بەفیڕۆ دەدەن لە نووسین دەستیان دەگیرا، یان هیچ نەبێت هەوڵێك دەدرا بۆ فێرکردنیان، چونکە بەڕاستی نووسین‌و ڕۆشنبیرکردنی نەوەیەك بە بیری ،و زانیاری هەڵەو زانستی نەزۆك، گەلەکەمان‌و کۆمەڵگاکەشمان بەرەو لادان‌و داڕمان دەبات‌و بەرەو هەڵدێری نا اریکی ئاڕاستە دەکات.

بۆ ئەو مەبەستەی سەرەوەو لە سەر داوای بەڕێزانی "پڕۆژەی تیشك" هەستام بە خوێندنەوەی چەند جارەی کتێبی "بیست‌و سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی" کە لە نووسینی "عەلی دەشتی"یەو "فریاد کەریم" وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، تاچەند ڕاستیەك هەیە بە خوێنەرانی ڕابگەیەنم‌و نووسینەکەش لە ڕێگەی ئەوانەوە خانە خوێی بۆ دیاریی بکرێت، ئاخۆ هی ئەوەیە مەدالیای بدرێتێ، یان چۆن (ڕێگری تەندروستی) دەخرێتە سەر نەخۆشێکی ڤایرۆساوی، ئاواش ئەم کتێبە ڕێگری خوێندنەوەی بخرێتە سەر.

ئەوەی من دەمەوێت بیڵێم‌و بینووسم سەبارەت بەم کتێبە ئەوەیە زۆرم خوێندووەتەوەو لە وەش زیاتر ناوبانگی نووسینی چاکم بیستووەو مەشخەڵی نووسینی چاكو ئەکادیمی‌و زانستیم بەچاوی خۆم بینییوەو خەڵکی ڕۆشنبیرو شارەزاش بۆیان باس کردوم کە کام نووسینە دەچێتە خانەی نووسینە چاکەکانەوەو، کامەش جێگای لە نێو کتێبخانەکاندا نابێتەوەو پێویستە بە ئامێری پارچە پارچە (تقطیع)، پەرش‌و بڵاوبکرێتەوەو لە ناوی بەرن.

هەرچەندەش خوێندنەوە لە دوای خوێندنەوەو پراوپڕکردنی بەڵگەکانی لەگەڵ سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا بۆم دەرکەوتووە ئەم نووسینەش زۆر دوورە لەو جۆرە نووسینانەی کە خەڵات وەرگرن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە تایبەتیش کە نووسینەکە لەسەر بیروباوەڕێکی بە وتەی خۆی تۆکمەو دیکۆمێنتدار نووسرابێت، چونکە (بە وتەی نووسەر) هیچ ئاینێك بە ئەندازەی ئیسلام سەرجەم دەقەکانی بە شێوەیەکی ڕاستی لە بەردەستدا نییە.

نووسەر سەرەتا کتێبەکەی وەك کتێبێکی چیرۆك ئامێز نووسیوەو هیچ پێڕستێکی نە لەپێشەوەو نە لەپشتەوەی، کتێبەکەی بۆ دانانەناوە، کە لە نووسینی خەڵکی نووسەر بچێت، تا بتوانیت ئەو بابەتەی کە دەتەوێت لە پێڕستەوە بەدوایدا بگەڕێیت.

لەمەش کارەساتبارتر ئەوەیە کە دەقێك دەهێنێت باسی سەرچاوەکەی، یان هەرناکات، یان کە باسی دەکات بەناوی نووسەرەکەیەوە دەیڵێت، کە لەوانەیە ئەو سەرچاوەیە چەندجار لە چاپ درابێتو هەر چاپەشی بەشێوەیەك، یان ئەو نووسەرەش چەند ناوێکی وا هەبێت، بۆ نموونە لە نێو نووسەرانی مسوڵماندا لە مجۆرە زۆر هەن وەك هەردوو (ئیبن حەجەر) کە یەکێکیان ئیبن حەجەری عەسقەلانییەو فەرمووودەناسە، ئەوی تریان ئیبن حەجەری هەیتەمییەو شەرعزانە، یان هەردوو ئەبوبەکری ڕازی، کە یەکێکیان لە فەلسەفە نووسیویەتیو ئەوەی دیکەیان لە ڕاڤەکردنی قورئان، لە مانەش نزیکتر هەردوو (جەلال)ە، کە تەفسیری (جەلالەین)یان نووسیوەو بە جیاش نووسینی تایبەتی خۆیان هەیە.

بۆیە ئەگەر بتەوێت بەدوای ڕاستی قسەیەکیدا بگەڕێیت چەند مانگت دەوێت بۆ ئەوەی ڕاستیو درۆی نووسەر بزانیت، ئەمەش گومان هەڵنەگرە کە یان نووسەر لە نووسین نازانێت، یان بۆ ئەوەیە کە درۆو ناڕاستی زۆری نەقڵ کردووەو نایەوێت ئاشکرا بن، خۆ ڕاستە هەندێجار نووسەر قسەی ڕاستیشی نەقڵکردووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە قسەی درۆو هەڵبەستراوی سەرسوڕهێنەری نەقڵ کردووە، ئەگەرنا مەنتیقی نییە کە پەرەگرافێك نەقڵ دەکات، نەسەرچاوەکەی، یان ساڵی چاپی سەرچاوەکە، یان شوێنی پەرەگرافەکە، یان ئەو لاپەڕەیەی کە پەرەگرافەکەی تێدا نەقڵ دەکات باسی هیچیان ناکات، بۆ نموونە لە (لا4)و (پ5)ی دێڕی (1)دا دەڵێت "واقیدی بە شێوەیەکیتر لەبارەی لەدایکبوونی (محمد)ەوە دەدوێت: هەر کە لەدایکبوو....".

ئەم پەرەگرافە تەنها خاڵێکی لێوە باسکردووە کە واقیدی (أبو عمر عبدالله بن عمرو واقدی لە 130 کۆچی لە دایکبووە ...)

دەبێت ئەم پەرەگرافە چۆنو لە چ کتێبێکدا بدۆزیتەوە، لە کاتێکدا کە کتێبە مێژووییەکانی وەك (البداية والنهاية)و (تأريخ الطبري)و چەند کتێبێکی تری مێژوویی کە هەردووکیان لە چەند بەرگ پێکهاتوون، چەند جارێکیش لە چاپ دراونەتەوە، هەرجارەی جۆرێك چاپ قسەی واقدیان نەقڵ کردووە لە زۆر شوێندا، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکە واقدی وەك نووسەرێکی مێژوو چەندەها کتێبی نووسیوە، بە پێی سەرچاوەکانی مێژوو کە دەڵێن لە کاتی بارکردنی ماڵەکەیدا لە بەغداد لە بەری کە رخەوە بۆ ڕەصافە باری چەند وشترێك نووسینی خۆی بووە، ئاخۆ ئەم پەرەگرافە لە کام سەرچاوەدایە.

لە ڕوانگەی نەقڵکردنی سەرچاوەکانی، درۆی شاخدار دەکاتو لە لا14و پ1ی دێڕی 1 دەڵێت "لەبارەی سەردەمی منداڵی (محمد)ەوە زانیارییەکی وا لە بەردەستدا نییە".

بەڕوونی ئەم درۆیە دیارە کە خوێندکارێکی سەرەتایی دەزانێت حەزرەتی (موحەممەد) (ﷺ) کە باوکیو باپیریو باپیرە گەورەی هەتا شەش پشتی دەزانرێت، دایکی کێیەو کچی کێیەو لە چ هۆزێکەو لە چ ساڵێکدا لە دایکبووەو کەی باوکیو دایکی مردووەو کێ شیردەریەتی؟ لە منداڵیەوە بەچیەوە خەریکبووەو لە ژێر چاودێری کام مامیدا بووە؟ تا دوایی، دەنا ئەگەر بۆسەرچاوەی مێژوویی بگەڕێین سەدەها سەرچاوەو [1] زانیاری دروست لە سەر ژیانی منداڵی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ)و ئەو قۆناغەی کە پێیدا تێپەڕیوە ساڵ بە ساڵ، تا ئەوکاتەی لە قۆناغی منداڵی دەچێتە گەنجیو پاشان پەیامو پێغەمبەرایەتیو پاشانیش مردنیو ناشتنی، بەڵگەی ناونووسینەکەی خۆی لا3 [2]، پ2، دێڕی (1ـ6) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە نووسینەکە بەها زانستییەکەی لە دەستداوەو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە زۆر بێبەڵگەیە، ئەگەرنا نووسەر خۆی لە هەمان لاپەڕەدا زانیاری ورد نەقڵ دەکات لە سەر منداڵیی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ)، لە لا14 پ1 کە باسی شوانیەتیو ژیانی ماڵی مامیو خولیای هەتیوی حەزرەت دەکات، هەربۆیە دەڵێم نووسینی زانستیانە

[1] هەزاران کتێب لە بارەی ژیانو ڕووداوی (23) ساڵی لەدایکبوونو مردنو هەموو کردارو وتەکانی ئەم پیاوە نووسراوە .

[2] لە پ2، دێڕی (1ـ5) هەروەها پ5، لا 41، دێڕی (1ـ3)
پاشان سەیری پ7، لا (51)، دێڕی (1ـ4)، هەروەها پ2، لا (53)، دێڕی (1ـ3)، پ3، لا (53) دێڕی (2ـ2) پ4، لا (53) دێڕی (1ـ2)

ئەوەیە ڕاستەوخۆ دەقەکان وەربگرێت‌و بە مەنتیقی عەقڵی دروست‌و تەندروست لێکیانداوەتەوە ڕەخنەکان بنووسێت، نەك گریمانەو گومان بکاتە بنچینەی نووسینەکەی‌و ئەو هەموو مێژوونووس‌و ڕۆژهەڵاتناسانەی کە بە ئینسافەوە شتیان نووسیوە بخاتە خانەی گومان، ئەوەتا لە (لا 17، پ3، دێڕی (5) دەڵێت "ئەوەشی کە ئێمە دەینووسین لە گریمان‌و مەزەندەیەك بەولاوە زیاتر نییە" سەرەتا دەڵێم: "إذا تطرق الى الدليل الاحتمال، سقط به الاستدلال" کە واتە ئەوەی نووسەر دەیکاتە بەڵگە هیچ بەهایەکی نییە، کەس لێی وەرناگرێت بەخۆڕاییش! پاشان مێژووی ئێمە بە هەموو پێکهاتەکەیەوە لە ڕووی زانستی نەقڵ بوونەوە زۆر جیاوازی هەیە لەوەی مێژووی گەلانی تری پێنەقڵ بووە، ئەوەی لەسەر ئەساسی زانستی فەرموودە نەقڵکردن گەیشتووە بە ئێمە، کە مەرجی تایبەتی هەیە، ناکرێت لێرەدا باسیان لێوەبکەین، لە لایەکی ترەوە ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات کە ئایا دەکرێت فیکرو سیستمێکی ئاینیی لە هەموو لایەنەکانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری بەگریمانی کە سێکی بێ بەڵگە هەڵبوەشێتەوە؟! چونکە هەموو نووسینێك لەم سەردەمەدا، یان بە بیری مەعقول، یان بە داتای مەنقول وەڵام دەدرێتەوە، ئەگەر هەموو بەڵگەیەکی نووسەر گریمان‌و مەزندە بێت لەسەر عەقڵی خۆی، نەك زانستی باوەڕپێکراو، یان سەرچاوەدار، ئاخۆ دەبێت لە ئاستی زانستیدا ئەم کتێبە بچێتە خانەی زانستیی؟! بەبڕوای من خانە نابێت جێگەی ئەم نووسینەی تێدا بێتەوە، مەگەر بیرو عەقڵی نووسەر، یان خەڵکی وەك نووسەر، خۆ گریمان‌و مەزندەکانی نووسەر هەر بەوەوە ناوەستن، ئەوەتا جارێك باسی گومان‌و دوودڵی‌و ڕاڕایی حەزرەت دەکات لە لا (37) پ1، دێڕی (6) "ئینکاری کردن لە خەڵکدا دەرکەوت‌و لە ئاکامدا حاڵەتی گومان‌و دوو دڵی‌و ڕاڕایی بوون لە (محمد)دا دەبینرێت" ئەوەندەی پێناچێت دوای دوو لاپەڕە باسی ماندوونەبوون‌و کۆڵنەدانی حەزرەت دەکات‌و لە لا39، پ4، دێڕی (5) دەڵێت "بەرامبەر بە سوکایەتی‌و بوختان‌و ناوناتۆرەی ئەوان دەستی لە خەبات هەڵنەگرت‌و کۆڵی نەدا"، دەبێت جگە لە نووسەرو وەرگێڕ کێ بتوانێت واتای ئەم دوو پەرەگرافە لێکبداتەوە؟ یان لە پ2، لا41، دێڕی (1–5) هەروەها پ5، لا 41، دێڕی (1–3) پاشان سەیری پ7، لا51، دێڕی (104)، هەروەها پ2، لا53، دێڕی (1–3)، پ3 لا53، دێڕی (1–2)، پ4 لا53، دێڕی (1–2).. ئەم جۆرە دژە پەرەگرافانە ئەوە دەسەلمێنن کە نووسەر پاش ئەوەی چیرۆکە بوختاناوییەکەی تەواو کردووە هەڵنەستاوە بە پیاچوونەوەی، بۆ ئەوەی خۆی خۆی بەدرۆنەخاتەوە، درۆکانی‌و قسە دژ بەیەکەکانی پینە بکات، ڕاستەوخۆ بەرهەمە دڕکاویەکەی داوەتە چاپخانە (ئاخۆ دەبێت چ دەزگاو دامەزراوەیەکی گومانلێکراوی لە پشتەوە بێ‌و چ هاوکارییەکی ماددی‌و مەعنەوی بۆ دابینکرابێت، تا ژیانی کولەمەرگیی خۆی دابین کردبێت‌و بۆی بووبێتە لیزە پاس‌و وڵاتی بەجێهێڵابێت).

لە ڕاویەکی ترەوە ئەسڵی سەرچاوەکەم بە زمانی خۆی لە بەردەستدا نەبوو تا بزانم کە ی نووسراوە تەنها سەرچاوە کوردیەکەی نەبێت، ئەویش چاپی دووەمی کە لە ساڵی (1999) لە چاپدراوە، مەبەستیش لە نووسین‌و وەرگێڕانی لە وە بەدەرنییە کە ئەسڵی نووسینەکە مەرامی تایبەتی لە پشتەوەیەو وەرگێڕانەکەشی بەهەمان شێوە، ئەگەرنا زۆربەی زۆری کتێبە زانیاری ڕەخنەییەکان کورتەیەك لە ژیانی نووسەر تۆمار دەکەن بۆ ئەوەی ئاستی زانستی‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری‌و بەرهەمە چاپکراوەکانی بزانرێت، تا لە ڕێگەی ئەو کورتە باسەوە بڕیاری بەشێك لە زانستیانەی نووسینەکە بدرێت. بۆیە دەکرێت بڵێم نووسینەکە لە کۆکراوەی ئەو نووسینانەیە کە لە سەدەکانی (19و20)ی ئەم سەردەمەی پێشوودا نووسراوەو دزیەکی ئەدەبییەو هیچی تر، دەنا نووسەر دەبا بێباکانە نووسیبا، کورتەی ژیانی‌و پلەی زانستی و سەرچاوەکانی کە بەچاو نەیبینیون! تۆمار بکات بەهەمان شێوەش وەرگێڕ ئەویش بێباکانە وەرگێڕانەکەی نووسیبا، ناوی خۆی لە سەر تۆمار کردبا، پلەی زانستی‌و بەرهەمەکانی.

لەکۆتاییشدا دەڵێم هیچ کتێبێکم بەرچاونەکەوتووە ئەوەندە دووربێت لەڕووی لێکۆڵینەوەی زانستیی، بەبەڵگەی ئەوەی ڕووداو باس دەکات مێژووەکەی ناڵێت، باسی کوشتن دەکات، نە کوژراوەکە ناو دەهێنێ نە بابای بکوژی، تۆبڵێی نووسەر ترسی هەبێت کە وا کێشەیەك ڕووبدات لە نێوان بنەماڵەکانیاندا، یان ترسی لە وە هەیە بڵێن فیتنەچیەو دووچاری زەرەرو زیان دەبێت، یان نانبڕاوی بکەن؟!!، وەك ئەوەی لە لا138، پ1، دێڕی (5) "یان لە ڕووی قینی شەخسییەوە کە سێکیان دەکوشت‌و بەناوی ئیسلامەوە پاساو دەکرا، هەروەك ئەوەی کە بۆ بازرگانێکی یەهودی هاتە پێش کە لەگەڵ مسوڵماناندا هاتووچۆو پەیوەندی پتەوی هەبوو"، ئەم دەقەی کە نەقڵمکرد سەرەتا لە بەرگی یەکەمدا وامزانی باسی لای خۆمان دەکات، گوایە کە سێك کوژرابێت لەم سنوورە! تا بڕگەی دوای ئەوەم خوێندەوە، دەنا دەبا

ناوی یەهودیەکەو ناوی بکوژەکەی‌و هۆکاری کوشتنەکەی باس کردبا، وەك چۆن لە پەرەگرافی دوای ئەوەدا باسی شتێکی لەو جۆرە دەکات، ئەوەش کە دەڵێت پەیوەندی پتەوی هەبوو لەگەڵ مسوڵماناندا، بەڵگەیە لە سەر نووسەر کە جیاوازی بیروباوەڕ وای نەکردووە لە مسوڵمانان کە پەیوەندیان تەنها لەگەڵ هاودینی خۆیان هەبێت، بەڵکو لە سەر بنەمای هاولاتی بوون مامەڵەیان لەگەڵ هەموان کردووە وەك مرۆڤو مامەڵەی مرۆڤانە، لێرەشدا نازانم کێشەکە چۆن بووەو نووسەر باسی لێوە ناکات، تا بزانین ئەو یەهودیە بەستەم کوژراوە، یان حەقی ئەوەی هەبووە بکوژرێت، یان هەڵەیەکی یەکێك لە مسوڵمانان بووە، کە ئیسلام بەرپرسیار نییە لە هەڵەی هەڵگرانی.

ئەمانەی پێشوو باسگەلێك بوون زیاتر ڕوو لە نووسەر دەکەن وەرگێڕیش پشکی خۆی بەردەکەوێت لە ڕووی مەبەست لە وەرگێڕانەکەو باس نەکردنی پلەی زانستی وەرگێڕ، نەهاتنی ناوی ڕاستیی‌و نازناوی کە ئەمیش جۆرێکە لە خۆحەشاردان، نەوەك عەیب‌و عارەکان ئاشکرابن‌و لە کە داری بکەن، دەنا نووسینێکی وەرگێڕاو بۆ دەبێت تەنها پێشەکی چاپی دووەمی تێدا باس بکرێت، هەروەها نەمدیوەو نەشم بیستووە کە کتێب تەنها پێشەکی کۆتا چاپی بنووسرێت، ئەم نووسراوە نەبێت، تۆ بڵێی لە چاپدان ئەوەندە گران بێت، هەم پێشەکی یەکەمی وەرگێڕاوەکە هەتا نەبوونی ژمارەی سپاردنی کتێبەکە (وەك سەیارەی بێدایك‌و باوکی لێکردووە) خوێنەر تابێت گومانەکانی زیاد دەکات‌و بەرهەمە کاڵ‌و کرچەکەی لە بەرچاو دەکەوێت‌و لە خانەی هەرە خراپترین نووسینی وەرگێڕاندا دای دەنێت.

# بەشی دووەم

## ڕەخنەکان لە سەر نووسەر

لەم بەشەدا خاڵ بەخاڵ لەگەڵ ئاڕاستەی کتێبەکەدا دەڕۆم، بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت نووسەر چ هەڵەو بوختانێکی ناوناوە کتێب‌و وەلامەکانیش چۆنن، هەر سەرچاوەیەکیش نەقڵ دەکەم زانیاری تەواوی لەبارەوە تۆماردەکەم، بۆ ئەوەی خوێنەر بتوانێت بگەڕێتەوە لە کاتی بوونی هەرگومان‌و ئیلتیباسێکدا بۆی.

**ڕەخنەی یەکەم:** نووسەر لە لا 7 پ1، دیڕی (1....) دەڵێت: "لەهەر کۆمەڵیەد، سەرچەندە فاسدو خراپ‌و دواکەوتووش بێت، بەلام ژمارەیەك مرۆڤی ڕوناکبیرو تێگەیشتوو هەن کە قسەی ڕاست‌و پەسەند دەکەن‌و لە زاری هەرکەسێکەوە هاتبێتە دەر پشتگیری لێدەکەن، کە دەبێت ئەبوبەکر بەیەکێك لە م کە سانە دابنرێت".

دەڵێم: ئەوەی بەوردی ئەم پەرەگرافە بخوێنێتەوە سەری سووڕ دەمێنێت لە چۆنییەتی بیرکردنەوەی نووسەر، کە چۆن لە ناکۆکیدا دەژی‌و بیر دەکاتەوە، ئەگەرنا هیچ عاقڵێك ڕێگە بەخۆی نادات لە یەککاتدا باسی عاقڵی‌و ژیریی‌و زیرەکیی‌و لە هەمانکاتدا سادەیی بێهۆشی‌و نەزانی کەسێك بکات. ئەوەتا نووسەر باسی ئەبوبەکر دەکات بەو هەموو ڕۆشنبیریەو ڕاستگۆیی‌و پاڵپشتی ڕاستگۆیانە باسی لێوە دەکات. بە ئاسانیش بە قسەکانی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) قەناعەت دەکات، هەروا بە ئاسانی جڵەوی عەقڵی خۆی دەداتە دەست کەسێك کە لە تەمەندا لە خۆی گەنجترەو لە ئەزموونی کۆمەلایەتی‌و بازرگانی‌و ناسینی کە سەکاندا هاوشانی ئەبوبەکر نابێت.

ئەبوبەکر بوو بەسووری بەرلەشکرو دەست دەکات بە بانگکردنی ئەوانەی کە متمانەیان پێیەتی بۆ ئەم بانگەوازە تازەیە.

ئیبن هیشام لە بارەی ئەبوبەکر دەڵێت: "پیاوێکی دۆست بوو لە گەڵ هۆزەکەیداو خۆشەویستێکی سانا بوو، بەنەسەبترین کەسە لە قورەیشداو زاناترینیانە لە بارەی کەسناسییەوە، بازرگانێکی خاوەن ڕەوشتە، هۆکاری هاتنی خەڵکی بۆلای، هۆی زانستەکەی‌و دانیشتنە خۆشەکانی بوو[1].

[1] السيرة النبوية لابن هشام ج1، ص250، المطبعة العلمية (بيروت – لبنان).

ئەگەر ئەمە كە سایەتی كە سێكە مەنتیقییە هەروا ماڵو سەروەتی خۆیی بداتە دەم هەولو دژایەتی ڕەگو ڕیشەی كوفرو قورەیش بكات، بقۆزرێتەوەو فریو بخوات؟!.

لەبەرمبەردا دەكرێت موحەممەد (ﷺ) بەو هەڵكەوتوویی و زیرەكیی و خاوەن كە سایەتییەوە بانگی زاناترین كە س بكات بۆ بڕواپێهێنانی كە نێردراوی خودایە، مەسئەلەكەش بە قەناعەتی نووسەر وانەبێت.

ئەمە جگە لە دۆگمایی نووسەر هیچی تر نییە، خۆی لە ڕاستییەكان هەڵە دەكات و دەیەوێت بە بێژنگ بەر بە خۆر بگرێت، ئەگەرنا دوو كەسی وەك حەزرەتی موحەممەد (ﷺ)و ئەبوبەكر، كە لە خۆشگوزەرانیی و پێگەی كۆمەڵایەتیی و دیاردا بژین ژیانی كولەمەرگیی و نەداریی هەڵبژێرن، ئەگەر كارەكە بایەخی خۆی نەبێت كێ ئامادەیە واز لە و هەموو خۆشییەی ژیان بهێنێت؟، ڕاستیی و مەعقولییەتی ئاینە وا دەكات لە ئەبوبەكر كە لە پیاواندا یەكەم كە س بڕوا بهێنێت و بەهەموو توانایەوە كار بۆ ئەم بەرنامەیە بكات. ئەگەر نووسەر ئەوە قەناعەتییەتی لەسەر ئەبوبەكر دەبا هەرگیز خۆی بەهەڵە نەبردباو خەڵكیشی فریو نەدابا.

<u>**ڕەخنەی دووەم:**</u> نووسەر زۆر ڕەشۆكیانە مامەڵە لە گەڵ ئایەتەكاندا دەكات، كە ئایەتێك دەبینێت و لێی تێناگات بەتەواوی ڕاڤەكەی چۆنە، دێت و ئەو ماناو ڕاڤەیەی كە خۆی دەیەوێت بەسەریدا فەرزی دەكات، بوختانیش دەكات كە لەسەرچاوە ڕەسەنەكانەوە وەری گرتووە وەك ئەوەی لای خوارەوە:

1. لا24، پ3، دێڕی (1–4) "لە قورئاندا دەیان ئایەت هەیە كە گومڕاكردن و هیدایەتكردنی خەڵك بەمەیل و ئیرادەی خودا دادەنێت (إنك لا تهدی من أحببت ولكن الله يهدي من يشاء)" قصص 56.

دەڵێم، سەرەتا چاوبەستكردن پیشەی جادوگەرە، نەك نووسەر، ئەوەندەش نوسخەی قورئان لە سەر زەوی هەیە، هیچ كتێبێكی تر بەو ڕێژەیە نییە، كە واتە درۆ تەمەنی كورتەو نەدەكرا ئەوە بكەین، چونكە ئایەتەكە بەشی كۆتاییەكەی لەگەڵدایە، بەهەموویەوە پێیدەوترێت ئایەتی (56) كە كۆتاییەكەی بە (وهو أعلم بالمهتدين) دێت.

***پاشان تەفسیرو ڕاڤەی قورئان چۆن دەكرێت:***

تەفسیر لە زمانی عەرەبیدا واتە (ڕوونكردنەوەو پەی پێبردن)[1]، كەواتە تەفسیری قورئان واتە ڕوونكردنەوەی مانای ئایەتەكانی قورئان و پەی بردن بە واتاكانیان، نەك وەك هەندێ وا دەزانن تەفسیر، واتە تەئویل كە بەمانای لادانی مانای مەجازی بۆ مانای حەقیقی، ئەوە بۆ گونجاندن دەیكەن لەبەرئەوەی لەگەڵ عەقڵیان نایەتەوە.

هەرلەم ڕووەشەوەیە كە زانایانی تەفسیر هەندێكجار ڕای جیاوازیان هەبووە لە ڕاڤەی ئایەتێكدا كە ئەویش جۆری تەفسیركردنەكە ئەم جیاوازییەی دروست كردووە، بۆ نموونە: تەفسیری زمانەوانی، تەفسیری یاساكان، تەفسیری وشەكان، هەندێ جار لەژێر سایەی تەفسیردا كە تەفسیر سەرچاوەیەتی و لێكدانەوەی بۆكراوەو وەك سەید قوتب كردوویەتی.

هەربۆیە تەفسیرو ڕاڤەی قورئان خۆی لەخۆیدا كارێكی ئاسان نییەو بەهەموو كە سیش ناكرێت، جا بەتایبەت كەسێكی وەك نووسەرو نەخوێندەوارێكی وەك وەرگێڕ، چونكە تەفسیر ئاسان نییە، ئەوەندەش وەرگێڕانەكەی ئەستەمە، چونكە لە زمانی عەرەبیدا وشە هەیە بەچەند مانا بەكاردێت، بەلام لە زمانەكانی تردا وەرگێڕانی ئەو وشەیە هەریەك مانا دەبەخشێت، لە بەرئەوە دەبێت وەرگێڕ بەئەمانەتەوە كاری وەرگێڕان بكات، هەربۆیە لە كاتی ڕاڤەكردندا دەبێت كۆمەڵە مەرجێك ڕەچاو بكرێت بۆ ئەوەی ماناكان بەجوانی لێكبدرێنەوە ئەو كەسەی كە پلەی ڕاڤەكەر وەردەبگرێت:

1. دەبێت لە زمانی عەرەبیی و لە هەموو لقەكانی زمانی عەرەبیدا زۆر شارەزا بێت، وەك (نەحو، صرف، بلاغە، منطق،...).

2. دەبێت شارەزایی لە زانستی ناسخ و مەنسوخدا هەبێت، لە گەڵ ئاگابوون لە حوكمی عام لە گەڵ خاص و موجمەل و موفەصەل.

---

[1] المنجد اللغة، ص583، الطبعة الخامسة والثلاثون، تأليف لويس معلوف.

3. دەبێت ئاگای لە هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان و شوێن و ماوەو کاتەکەی هەبێت.

4. دەبێت ئاگای لەو ئایەتانە بێت کە موتەشابیهن (زیاد لە مانایەك هەڵدەگرن)و ئەوانەی کە موحکەمن (تەنها یەك مانا هەڵدەگرن).

5. دەبێت، یان هەموو قورئانی لە بەربێت، یان موفرەدەی قورئانی ئاگا لێبێت، بۆ ئەوەی بزانێت وشەکان لە چەند شوێندا هاتوون واتاکانیان چۆن دەگۆڕێت و بەچەند مانایەك دێن؟، هەر بۆ نموونە (كان) لە سێ ئایەتدا هاتووە، هەرئایەتەش واتایەکی هەیە، ئایەتی یەکەم (...وَكَانَ يَوْماً عَلَى الْكَافِرِينَ عَسِيراً) بەواتای ڕۆژی دوایی دێت، ئایەتی دووەم (وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ..) بەواتای کاتی ڕابردوو دێت، ئایەتی سێیەم (وكان الله عليما حكيما) بە واتای ڕابردوو ئێستاو داهاتوو دێت، لە کاتێکدا (كان) کرداری ڕابردووەو واتا (فعل ماضي) ڕێزمانییەکەی ڕابردوو دەگرێتەوە.

6. شارەزایی زانستەکانی ئوصولی فیقهو زانستی فەرموودە (علوم الحديث)ی هەبێت، بۆ ڕاڤەکردنی ئایەتەکانی ئەحکامی فیقهی کە چۆن گوناهێکی گەورە دەبێت بە گوناهی بچووك و چۆن ڕاڤەدەکرێت و کردارو گوفتارەکان چۆن پۆلێن بکرێن بۆ حەرام، مەکروە، موباح، موستەحەب، حەڵاڵ، چونکە داڕشتن ئایەتەکە دیاری دەکات کە حوکمەکە چۆن دەدرێت.

7. شارەزایی لە زانستی تەعاروزو تەرجیح دا هەبێت.

ئەم خاڵانەی سەرەوە دەبێت لە کەسێکدا هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێ تەفسیر بکات، خۆ ئەگەر بمانەوێت بزانین چۆن ڕاڤەبکەین دەبێت ئاگامان لەم خاڵانە بێت:

1. دەبێت هەرچی ئایەت هەیە لەو شێوەیە، یان مانایان لەیەك نزیکە کۆیان بکاتەوە.

2. دەبێت ئەو وشەیەی واتای جیاوازی هەیە لە ئایەتەکاندا ئاگای لێبێت.

3. هەرچی فەرموودەیە لە سەر ئەو بابەتە دەبێت ئاگای لێبێت و مانای بزانێت.

4. ئەو واقیعەی کە ئایەتەکەی تێدا هاتووەتە خوارەوەو چۆن جێبەجێکراوە لە زیهندا حازری بکات.

5. ئاگای لە وتەی هاوەڵانی پێغەمبەر بێت، سەبارەت بە ڕاڤەکردنی ئایەتەکە.

ئێستاش دێینە سەر ڕاڤەکردنی نووسەر کەسەرەتا ئاماژە بۆ هیچ سەرچاوەیەکی زانستی ناکات، جگە لە قسە بێ سەروبنەکانی خۆی کە لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد، لە ڕاستیدا هیدایەت لە قورئاندا بەشێوەیەکی گشتیی بە دوو مانا هاتووە، ئەوانیش هیدایەتی تەبلیغییەو دەکەوێتە سەرشانی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ)و پاشانیش هەڵگرانی بەرنامەی ئیسلام و قورئان بەشێوازەکەی ڕێنماییان دەکات کە دەفەرمووێ (ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)، ئایەتی(125) سورەتی(النحل)، بەگشتیی ئایەتی هیدایەتی و تەبلیغی ئاڕاستەی پێغەمبەری ئیسلام دەکرێت(ﷺ) کە دەفەرموێت (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) شورا (52).

هیدایەتی دووەمیش هیدایەتی تەوفیقییە کە لە دەسەڵاتو ئیرادەی خودایەو خۆی دەزانێت هیدایەتی کێ دەداتو لە هەندێ حاڵەتیشدا هەندێ سنوورو مەرجی دیاری کردووە کە کێ موستەحەقە بەو هیدایەتە، ئەوەتا لە سورەتی البقرة (258) لە بەشی کۆتاییدا دەفەرموێت (والله لايهدي القوم الظالمين) هەروەها لە سورەتی آل عمران) (86)دا دەفەرمووێت (كَيْفَ يَهْدِي اللّهُ قَوْماً كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُواْ أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) لە چەند جێگەیەکی دیکەدا بەهەمان شێوە دەفەرمووێت (يهدي به الله من اتبع رضوانه سبل السلام) هەروەها (أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ .... إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ) بە واتای خوای گەورە هیدایەتی کە سانی درۆزن و حەقداپۆشەر نادات. بە شێوەیەکی گشتیی خوای گەورە لە (18) ئایەتدا ئەوکەسانە دیاری کردووە کە هیدایەتی تەوفیقی نایانگرێتەوە، بە تایبەت دەربارەی سێ کۆمەڵ کەس ئەوانەش (ستەمکار، کافران، فاسقان) دووبارە دەکاتەوە وەك لە ئایەتەکانی سورەتی

البقرة (258، 264)، آل عمران (86)، المائدة (51، 67، 108) الانعام (144)، التوبة (19، 24، 37)، النحل (107)، الاحقاف (10)، الصف (5، 7)، الجمعة (5)، المنافقون (6).

هەروەها (درۆزنان) لە سورەتەکانی الزمر (3)، غافر (28).

کەواتە هیدایەتی تەوفیقی کە لە لای خودایە مەرجو بنەمای تایبەتی هەیە، هەربۆیە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ..) قصص، (56).

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەش ئەوەیە کەموسلیم لە أبوهریرەوە دەگێڕێتەوە کە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئەبوتالیبی فەرموو کاتێ لە سەرەمەرگدا بوو بڵێ (لا إله الا الله) بۆ ئەوەی شایەتیت بۆ بدەم لای خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا، بەڵام مامەی سەرپێچی کردو شایەتومانی نەهێنا، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ...)[1]

هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە زۆر ئاشکرا باس لەوە دەکات کە ئەبوتالیب هەموو شتێکی پێگەیشتووە، چونکە نزیکترین کەسە لە حەزرەتەوەو هاوژیانو هاوکێشەی حەزرەتە، بۆیە خوای گەورە ئەم خیتابە ئاڕاستەی حەزرەت دەکات، هەربۆیە لە سورەتی (النور) ئایەتی (46) دەفەرموویێت (لَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ مُّبَيِّنَاتٍ وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) موفەسیری گەورە (سعدي) لە تەفسیری (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)[2] دەفەرموویێت (والله يهدى من يشاء) کە سانێك دەگرێتەوە کە پێشینەی باشیان هەبێتو جێپێی ڕاستگۆییان هەبێت، بەواتای ئەوەی ئایەتەکانی خوای لاڕوون بووەتەوە، ڕاستگۆیی خۆی بەرامبەر نواندووە، پاشان هیدایەتی تەوفیقیی وەرگرتووە، ئیمان نەهێنانی ئەبوتالیبیش لەوەوە نەهات کە ئیسلام بەحەق نەزانێ، بەڵکو لەوەوە هاتبوو کە لە عەیبەی قورەیش دەترسا، هەربۆیە لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە کاتێك حەزرەت (ﷺ) بەمامی وت بڵێ (لا إله الا الله) بۆ ئەوەی شاهیدیت بۆ بدەم لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەبوتالیب وتی: ئەگەر قورەیش تانەو توانجیان لێنەدایەم دڵم ئارام دەکردی ئەی موحەممەد (ﷺ)، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە[3].

سەبارەت بە ئایەتەکەش خۆی بەڵگەی ڕوونی تێدایە کە نووسەر ئاماژەی پێناکاتو خۆی بێئاگا دەکات ئەوەیە، کە لە بەشی کۆتایی ئایەتەکەدا دێت (وهو أعلم بالمهتدين) خوای گەورە دەزانێت کە کێ هیدایەت وەردەگرێت.

سەبارەت بە ئایەتی (23) سورەتی (الزمر) کە ئەو هێناویەتی (ومن يظل الله فما له من هاد) نەقڵی ئایەتەکە هەڵەیەو ئەمە ڕاستییەکەیەتی (..وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ) دەنووسیت کەسێك کە خودا گومڕای کردووە هیدایەتکاری ناوێت.

ئەمەشیان بەهەڵەداچووە، چونکە خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە کێ سەر لێدەشێوێنی، بەبەڵگەی ئایەتی (29) لە سورەتی (روم) کە دەفەرموویێت (..فَمَن يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ..) کە سەرتان سووڕدەمێنێت لە هیدایەت وەرنەگرتنیان، چونکە خوای گەورە بەستەمەکانیان سەری لێتێکداون، نەك ئەوەی نووسەر تێگەیشتووە[4].

<u>**ڕەخنەی سێیەم:**</u> لە لا51، پ3، دێری (1)و لە ڕاڤەی (مانعبدهم الا ليقربونا الى الله زلفى) دەڵێ: واتە ئێمە بتەکان دەپەرستین بۆ ئەوەی کە بەخودامان بگەیەنن.

بەبڕوای من قوتابییەکی پۆلی شەشەمی ئامادەیی ئەم تەفسیرە ببینێت دەزانێت هەڵەیە ئەگەر لە ژیانیشیدا تەفسیری نەخوێندبێتەوە، چونکە حەرفێکی نەفی کە (ما)یە لە پێش ڕستەکەدایە، کەواتە دوای ئەوە هەرچی کردارێك بێت دەبێت واتای نەفی لێوەربگیرێت، لە پاش ئەوە (الا) دێت کە هەڵاوێر (استثناء)یەو کردارەکە بە گشتیی ڕەفز ناکرێت، ئاخۆ دەبێت نووسەر لەو خاڵانەی کە باسمان کرد لە زانینی زمانی عەرەبیدا ئەبێت چەندی لێبزانێت، ئەمە بەڵگەیە کە بەقەدەر خوێندکارێکی ئامادەیی لێ نازانێت، کە واتە دەبێت تا چەند کتێبەکەی جێگەی خۆی بکاتەوە، ئەمە نووسەر، ئاخۆ

[1] پوختەی تەفسیری قورئان ص392–393، محمد ملا صالح باموکی، چاپی یەکەم 2004.

[2] ئەم سەرچاوەیە لە سەر سیدییە بۆیە ژمارەی لاپەڕەو جزئی تێدانییە.

[3] تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان.

[4] تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان.

دەبێت وەرگێڕ ئەم پەندی نەنابێتەوەو نووسەر چاکی تەفسیر کردبێت، بەلاَم کلۆڵی وەرگێڕ بێت لە ڕووی زمانەوانییەوە، دەنا ئەو ڕاڤەکردنەی بەو دەردە نەدەبرد.

ئێستەش بێینە سەر تەفسیری نووسەر، لە سەرەتاوە، واتە لە پەرەگرافی پێش خۆیدا هەندێك لە مانا نزیکەکەی باس دەکات، بەلاَم دیارە حەزی کردووە تەفسیر بۆ خەڵکی تازەخوێندەوار بنووسێت، بۆیە تەماحی خستۆتە بەر وەرگێڕو ئەویش بەکاری خیانەتکارانەی دەقێك وەك خۆی، یان زۆر نزیك لە خۆی نەبێت خیانەتێکی ئەدەبییەو دەبێت دادگایی بکرێت، لە ڕاستیدا عەرەبە کافرەکان، هەرچی ئەوانە کە بت دەپەرستن دەزانن بتەکانیان هیچ سوودێکیان نییە، تەنها بە نیازی نزیکبوونەوە لە خودای حەق، ئەو جۆرە پەرستنە دەکەن، بۆیە وتویانە ئێمە ئەمانە ناپەرستین ئیللا بۆ نزیکبوونەوە نەبێت لە خودای پاكو بێگەرد.

**<u>ڕەخنەی چوارەم:</u>** پ7، لا57 دێڕی (1–3) (واتە ئایا ناردنی قورئان بۆ تۆ بەس نییە کە تێیدا هەڕەشەو ڕەحمەت بۆ ئەهلی ئیمانە) بە وتەی نووسەرو وەرگێڕ ئەمە تەفسیری ئایەتی (51)ە لە سورەتی (العنکبوت) کە دەفەرموویێت (أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ).

ئەوەی لە بەردەستمدا بوو (6) جۆر تەفسیری موعتەبەر بوو، لەوە دڵنیا بووم کە ئەم ڕاڤەو تەفسیرەی نووسەر لە هیچ تەفسیرێکی ئەم ڕووی زەویەدا نییە، بەلاَم بابزانین چۆن بەراورد دەکرێت.

سەرەتا وشەی (هەڕەشە)م بەراوردکرد بە سەرجەم وشەکانی ئایەتەکە، نەك وشەکان ڕاستەوخۆ نایگرێتەوە، بەڵکو مانا جیاوازەکانی ئەم وشانەش نایگرنەوە، چونکە باسی ڕەحمەتو یادکردنەوەی ئەهلی ئیمانە نەك کافران، هەربۆیە بە هیچ شێوەیەك ئەوەی لێوەرناگیرێت کە ڕاڤەکەری فارسی باسی دەکاتو وەرگێڕی کوردی شایەتی ناحەقی بۆ دەدات، ئەمەش تەفسیری ڕاستەقینەی ئایەتەکەیە:

کافرەکان داوای نیشانەیەکیان دەکرد لە حەزرەت بۆ ئەوەی بە حسابی خۆیان قەناعەت بکەن، لە وەلاَمدا قورئان لە سەر زمانی حەزرەت دەفەرموویێت ئایەتو نیشانە لە دەسەلاَتی خودادایە، پاشان وەك ترساندنو سەرزەنشتێك وەلاَمی کافران دەداتەوە، "ئایا بەسیان نییە کە ئێمە قورئانمان بۆناردوون کە موعجیزەی سەردەمی خۆیانە بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە، ئەم قورئانە ڕەحمەتی خوای گەورەیە بۆ دنیایانو یادخستنەوەیەکە بۆ قیامەتیان"، ئەم دوو سیفەتە بۆ کەسانێك باس دەکات کە مسوڵمانن[1].

**<u>ڕەخنەی پێنجەم:</u>** پ4، لا71، دێڕی (1) "ئەگەر ئایەتی (32) لە سورەتی نەجم جیابکەینەوە، کە ڕوون نییە بۆچی عوسمانو هاوەلاَنی ئەم ئایەتە مەدەنیانەیان خستۆتە ناو ئەم سورەتەوەو تێیان ترنجاندووە، ئەوا وەك شیعرەکانی "سلێمان" جوانو شیرینو خەیالاَویە، بەو جیاوازییەوە کە لەم سورەتەدا باسی جوانی کچانی ئورشەلیمو ڕابواردن لە گەڵ کچانێکدا دەکات کە مەمکەکانیان وەك مەڕی سپی وان بەقەدپاڵی شاخی (جلعد)ەوە خەوتوونو نابینرێن".

ئەمە پەرەگرافێکە لەو کتێبەی کە بانگەشەی ئەوە دەکات لە سەرچاوەی ڕەسەنەوە وەرگیراوە.

سەرەتا زۆرینەی زانایان دەڵێن کە ئەم سورەتە سەرجەمی ئایەتەکانی مەکییەو تەنها لە ڕیوایەتێکدا نەبێت کە عەباسو عیکرمە دەڵێن: "ئایەتی (32) مەدەنییە"، ئەم قسەیەی (عباسو عکرمە) بە وشەی (روي) نەقڵکراوە، لە زانستی فەرموودەدا واتای لاوازیی دەگەیەنێت، لە ڕووی تەعاروزو تەرجیحەوە قسەی جمهور زاڵە بەسەر کەمینەدا، بۆیەش لە سەرەتاوە باسی چۆنییەتی تەفسیرم کرد، تا وەك نووسەرو وەرگێڕ تووشی هەڵەی حەزو ئارەزوو نەبینو مەنیقی قسەبکەین، لە کاتێکدا ئیبن مەردەوەیو ئیبن زوبێر لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕنەوە کە ئەم سورەتە لە مەککەدا هاتە خوارەوە.[2]

---

[1] فتح القدير، (ص238–239)، ج4، الشوكانى، طبع 1998م.
[2] فتح القدير، الشوكاني، ص125، ج5، 1998م.

ئەگەر ئەمە ماهیەتی زانینی فەرموودەناسییو زانستی تەعاروزو تەرجیحی نووسەر بێت، دەبێت چ زانایەك بێت؟!. پاشان وەرگێڕێك کە هیچ زانیارییەکی سەرەتایی لە ئیسلام نییەو نەگەڕاوە بەدوای ئەوەی تەنها یەك شتی نووسەری تەحقیق بکردایە، ئەویش نەدەکەوتە ئەم هەڵە گەورەوە.

**ڕەخنەی شەشەم:** پ3، لا96، دێڕی (1...) (ولقد نعلم أنك يضيق صدرك بما يقولون، فسبح بحمد ربك وكن من الساجدين وأعبد ربك حتى يأتيك اليقين) سورەتی الحجر (97، 98، 99) واتە: ئێمە دەزانین کە لەقسەی ئەوانە نیگەرانو قەڵس دەبیت، بەڵام ڕوو لە خوای خۆت بکە تا بەتەواوی دڵنیابیت.

ئەم چەند دێڕە تەفسیری سێ ئایەتە لە لایەن نووسەرێك کە وەرگێڕ شایەتی ئەوەی بۆ دەدات کە (کتێبی بیستو سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی ... بەیەکێك لەو نووسینە گرنگو بایەخدارە مێژووییانە دادەنرێت، کە بەمیتۆدێکی بابەتیانە لەسەر مێژووی سەرهەڵدانی گەشەسەندنی ئاینی ئیسلام نووسراوە...) پ1، لا1، دێڕی (1).

تەحەددای نووسەرو وەرگێڕ دەکەم لە وەتی تەفسیر دەنووسرێت جگە لەم کەسانەو حەقەکانی لای خۆمان، لە هیچ تەفسیرێکی باوەڕپێکراودا شتی وا نووسرابێتو وترابێت.

سادەترین بەڵگە، ئەگەر قسەی نووسەر ڕاست بوایە نەدەبوایە دوای قەناعەت کردن بەهیچ شێوەیەك عیبادەت بکرێت، کە ئەمە تەنها کەسێك قسەی وا دەکات، نەك تێناگات، بەڵکو نازانێ بۆچی تێناگات، لەم بارەوە قسەی فەیلەسوفێك نەقڵ دەکەم دەڵێت "خەڵك سێ بەشن:

1. پیاوێك دەزانێت، دەزانێت کە زانایە، ئەم زانایە شوێنی کەون.
2. پیاوێك نازانێتو دەزانێت کە نازانێت، ئەمەش داوای ڕێنوێنی دەکات، ڕێی نیشان بدەن.
3. پیاوێك نازانێتو ناشزانێت کە نازانێت، ئەوە دەبەنگەو وازی لێبهێنن.

بەڕاستی نووسەر لەم نەخۆشییەی سێهەمیەتیو وەرگێڕیشی دووچاری هەمان نەخۆشی کردووە، دەنا هەرکەس بیەوێت بزانێت تاچەند نووسەر سەرکەوتوو بووە لە نووسینەکەیدا، دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە تەفسیرەکان، زۆر بە ئاسانی تێدەگات، نووسەر، نەك سەرچاوەکانی ئیسلامی نەخوێندۆتەوە، بەڵکو منجیدێکی (کە فەرهەنگێکی عەرەبی – عەرەبییە) هێناوەو وشەکان چۆن لێکیداونەتەوە، بەبێئەوەی بزانێتو وەك ئاماژەمان پێکرد، وشە لە ڕستەدا مانای دەگۆڕێت، سادەترین نموونە (رغب) واتە حەزی لێکرد، یان هات بۆ لای، بەچوونە سەری (عن) دەگۆڕێت بۆ (پشتی تێکرد).

*نموونەیەکی تر:* لە زمانی عەرەبیدا، خەو بە دوو مانا دێت (رؤيا، أحلام)

خۆ ئەوەشی شارەزایی هەیە لە عەرەبیدا لە سیغەی ئایەتەکەوە تێدەگات کە (فسبح بحمد ربك وكن من الساجدين)، واتە هەمیشە سوپاسگوزاری خودا بەو لە نوێژکەران بە، هەتا بەمردن دەگەیت، ئەوەی لێوەرناگیرێت کە پێغەمبەرو یاران کە خودی نووسەر ئاماژە دەکات بۆ مسوڵمانی و ڕاوەستاویو ئیمان پتەوی هەندێکیان، ئەی بۆ عیبادەتیان بەردەوام بووە؟!.

**ڕەخنەی حەوتەم:** پ1، لا25، دێڕی (2–6) "چونکە سەلماندنی بوونی خوا کە پێغەمبەرەکان خۆیان بەنێردراوی ئەو دادەنێن، بۆ ئەوەیە کە جیهان بە ڕووداوێك دابنێن کە لە عەدەمەوە هاتووە، ئەگەر دنیا نەبووەو دروستکراوە، دیارە خولقێنەرێك دروستی کردووە، بەڵام خودی ئەم مەسەلەیە جێگای گومانەو شتێکی یەقین نییە".

نووسەر زۆر بە چاکی ناوێرێت خۆی لەم مەسەلەیە بداتو تەنها بە گومانەوە باسی دەکات، ئەگەرنا بوونی دروستکەرێك، کە ئەم گێتییەی ڕێکخستووەو ئەندازەی بۆ کێشاوە، دەتوانێت ماددەکانی لە عەدەمەوە بهێنێتە بوون، ئەمەش بووەتە هۆی ناوی خالق، کە لە نەبوونەوە بیهێنێتەبوون، خۆ ئەوەی لەم سەدەیەدا بیر لەوە بکاتەوە جیهانێك بەو هەموو پێکهاتە ئاڵۆزەی، (زانایان دەزانن لە سەدەی بیستو یەکدا چوار جار خۆر دەگیرێتو سەعاتو ڕۆژو مانگو ساڵەکەی)، هەرگیز ڕێگە بەخۆیان نادەن بیر لەوە بکەنەوە کە ئایا دروستکەر هەیە یان نا؟ بۆیە تەنها کۆمەڵە کەسێکی وەك کۆمۆنیستە کۆنەکانو چەند کەسێکی وەك نووسەر بەترسەوە باسی ئەو مەسەلانە دەکەن، چونکە دەزانن ئەمە

قسەیەکی کۆنەو سەودای نەماوە، هەربۆیەش لە کۆتاییدا ناچار دەبێت لە پ3، لا25 بڵێت "بەچاوپۆشین لەم مەسەلە دژوارو چارە هەڵنەگرە، ئەگەر وای دابنێین کە جیهانی (بوون) نەبووەو بە ئیرادەی خودا دروست بووە".

بەڵگەکانی بوونی خودا زۆر لەوە زیاترن کە ئێمە لێرەدا باسی بکەین سەرچاوە زۆرن با خوێنەران بگەڕێنەوە بۆلایان، چ سەرچاوەی عەقڵی و مەنیقی، یان سەرچاوەی نەقڵی، یان سەرچاوەی زانستیی و مێژوویی کە لە هەموو بارەکانەوە سەرچاوەی بەهێزو بابەتی بەپێز هەیە. تەنها نموونەیەك لەو شتە مەنتیقییانە: خودی نووسەر کە لەخۆی بپرسێت ئەو بیردەکاتەوە کە واتە ئەو بوونیی هەیە، ئەم بوونە چ سەرچاوەیەکی هەیە تا دەگاتە عەقڵێکی دروست کە ئەوی بەدیهێناوە، خۆ ئەگەر نەفی خودی خۆی بکات، ئەوە نەعامەئاسا خۆی لە خۆی وندەبێت‌و سەری لە هیچەوە دەردەچێت.

**ڕەخنەی هەشتەم:** پ1، لا29، دێڕی (11) "تەنانەت لە لایەن نەیارانیشی بەکەسێکی دەستپاك‌و ئەمانەتدار ناوبراوە".

ئەمە دوو دێڕ لەم پەرەگرافەی کە نووسەر هەموو وەسفەکانی حەزرەتی تێدا باسکردووە نازانرێت لە چ سەرچاوەیەکەوەیە، بەڵام ئەوەی لای من جێگەی مەبەستە ئەوەیە کەسێك دوژمنەکەی شایەتی ئەوەی بۆ بدات کە دەستپاکەو ئەمانەتپارێزە، واتە نەئەزانێت درۆ بکات، نە قەناعەتی پێیەتی، چونکە مرۆڤ هەیە، وەك نووسەر قەناعەتی بە درۆ هەیە، بەڵام نازانێ بیکات، هەیشە قەناعەتی بە درۆ نییە، بەڵام دەزانێ دروستی بکات، بەهەرحاڵ ئەگەر سیمای موحەممەد (ﷺ) ئەوە بێت لە ژیانی نە درۆی کردبێت، نە ڕێگەی بە کەس دابێت درۆی لەگەڵ بکات، نووسەریش قەناعەتی بە ڕاستگۆیی هەبێت بۆ دەبێت بڕوا بە قسەکانی نەکات، کە خودا دەفەرمووێت "ئەی موحەممەد بڵێ من بەشەرێکم‌و تەنها جیاوازیم لە گەڵ ئێوە ئەوەیە وەحیم لە لای خوداوە بۆ دێت، خۆ ئەگەر نووسەر دەیەوێت درۆی شاخداری وا بکات کە دەڵێت "لە ئەنجامی خەیاڵاتدا دروستبووە" وەحیەکانی خۆ هەمیشە لە خەیاڵدا نەبووە، ئەمە جگە لە نەخۆشی شیزوفرینیا کە دووچاری نووسەر بووە، هیچی تر نییە، کە لە لایەك حەزرەت وا باس دەکات، لە لایەکی دیکە گومانی لە قسەکانی هەیە، لە لایەك باسی بێ تەماعیی دەکات، لە لایەك باسی هەوڵی وەدەستهێنانی سامان‌و دەسەڵاتی دەکات، هەربۆیە خۆزگە دەکرا نووسەر پشکنینێکی پزیشکیی دەروونیی بۆ دەکرا، ئەوکات دەمانزانی چ مرۆڤێکی ساغ‌و سەلامەتە لە ڕووی دەروونییەوە!!.

**ڕەخنەی نۆیەم:** نووسەر بۆ چاوبەستییەکانی، زۆر جار دەقەکان بە وەرگێڕدراوی دەهێنێتەوە. ئەوەتا لە پ4، لا31، دێڕی (1..4) دەنووسێت "لەسەرەتادا وەحی وەك خەیاڵات‌و خولیای چاکە سەری لێدەدات‌و وەك شەبەقی بەرەبەیان سپی بوو، ...".

ئەمە دەقی ئەو فەرموودەیەیە کە عائیشە گێڕاوێتییەوەو نووسەر نەیوێراوە دەقە عەرەبییەکەی بنووسێ "قال ابن إسحاق: فذکر الزهري عن عروة بن الزبير، عن عائيشة رضي الله عنها أنها حدثته: أن أول مابديء به رسول الله (ﷺ) من النبوة، حين أراد الله كرامته ورحمته العباد به، الرؤيا الصادقة، لايرى رسول الله (ﷺ) رؤيا في نومه الا جاءت كفلق الصبح، قالت وحبب الله تعالى إليه الخلوة، فلم يكن شيء أحب إليه من أن يخلو وحده)[1].

ئەوەی کەمترین شارەزایی هەبێت لە زمانی عەرەبیدا دەزانێت کە وەرگێڕی ئەم فەرموودەیە هیچ لە زمانی عەرەبی نازانێت، وەرگێڕەکەی بۆ زمانی کوردیش هەوڵی نەداو بزانێت، ئایا ئەصڵە عەرەبییەکەی چۆنە؟، دیارە ئامانجەکە ڕوونە لە وەرگێڕانەکەی.

لە نووسەر دەپرسم کام وشەی عەرەبی لە دەقە عەرەبییەکەدا واتای (خەیاڵات‌و خولیای چاکە) دەگەیەنێت، هەر بۆیە دەڵێم نووسەری قەڵەمباك هەمیشە هەوڵ دەدات دەقەکان وەك خۆی وەربگێڕێت، لەگەڵیاندا هەمیشە دەقی بەرامبەر ئاماژە پێدەکات، وشە وشە وەریدەگێڕێت، پاشان تەعلیقی گونجاوی لەبارەوە دەدات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە

[1] السيرة لإبن هشام، ج1، ص234، و فقه السيرة، محمد سعيد رمضان البوطي، ص82.

نووسەر خیانەتێکی گەورەی کردووەو وەرگێڕیش نەقڵی ئەو خیانەتەی کردووە بۆ زمانی کوردی، کە پێویستیان بە لێپێچینەوە هەیە.

*هەربۆیە دێمە سەر مانای کوردیی فەرموودەکە:*

سەرەتا باسی وشەی (رؤيا) دەکەم کە لە چییەوە هاتووە، لە وشەی (رأى)وە هاتووە بەمانای بینین، عەرەب بە بینین لە خەودا دەڵێن (رؤيا)[1]. لە ڕووی واتاو لێوەرگرتنەوە، ئەو خەوەی ئەنجامی نارەحەتیو خەیاڵاتی مرۆڤە پێی دەوترێت (أحلام)، ئەوەتا لە سورەتی یوسفدا هاتووە (أضغاث أحلام) ئەوەشی بەبێ ئەو هۆیانە خەو ببینێت پێی دەوترێت (رؤيا الصادقة)، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەم کتێبە لە ڕووی بەهای زانستییەوە چەند بێ بەهایە، نووسەرێك نەزانێت سادەترین وشەی عەرەبی وەرگێڕێتە سەر زمانی فارسی، پاشانیش کوردی، دەبێت چەند ئەمانەتی پاراستبێت؟!، سەبارەت بەوەی (كفلق الصبح) واتای دەکات کە وەك (شەبەقی بەرەبەیانی سپی بوو)، ئەمەش تێنەگەیشتنێکی دیکەی نووسەرە، ئەگەرنا فەرموودەکە باس لەوە دەکات حەزرەت لە خەودا هەرچی بدیایە وەك ڕۆژی ڕووناك دەهاتەدی.

**ڕەخنەی دەیەم:** پ1، لا (37)، دێری (8-9) "بەداخەوە قورئان خراپ ڕێکخراوەو ئەوپەڕی بێ زەوقی لە داڕشتنیدا بەکارهاتووە، تەواوی خوێنەرانی قورئان سەریان لەوە سوڕماوە کە بۆچی ئاساییترینو مەنتیقیترین شێوە داڕشتنیان بەکارنەهێناوەو قورئانیان وەك نوسخەی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) واتە بە پێی مێژووی هاتنەخوارەوەی، کۆ نەکردووەتەوەو دایان نەڕشتووە".

پێش ئەوەی نووسەر ببێتە وەکیلی قورئانخوێنانو باسی ئەوە بکات کە خوێنەرانی قورئان سەریان سووڕماوە، منیش لە عەقڵی نووسەر سەرم سوڕماوە، کە عەرەب دەڵێن (الانسان عدو لما جهله)، واتە مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت، بەڕاستی ئەم پەندەی زۆر چاك بەسەردا دەسەپێت، ئەگەرنا کەسێك تۆزقاڵێك زانیاری هەبێت لە سەر ئیسلامو ڕەشۆکیانە بیر نەکاتەوە، لەوە تێدەگات قورئان چۆن نووسراوەتەوەو چۆن کۆکراوەتەوە کە نووسەر لێی تێکچووە لە نێوان نووسینەوەو کۆکردنەوەدا، لە هەمانکاتدا ئەوەی لە بیرچووە کە لە ئیسلامدا کۆمەڵە بابەتێك هەن پێیان دەوترێت تەوقیفی، (واتە ئەمری خودایەو بۆ پێغەمبەریش نییە دەخالەتی تێدا بکات)، کۆمەڵێ شتیتر هەن کە ئیجتیهادینو زانایانی ئیسلامی بەپێی بنەما زانستییەکان دەتوانن ئیجتیهادی تێدا بکەن، بۆیە بۆ نووسەرو خوێنەرانیش با ڕوون بێت کە قورئان سێ قۆناغی بەخۆیەوە بینییوە، یەکەم نووسینەوەی قورئان، سەبارەت بەم مەسەلەیە، قورئان هەر لە سەردەمی حەزرەتدا نووسراوەتەوەو جگە لە قورئان نەیهێشتووە هیچیتر بنووسن، ئەوەتا دەفەرموێت (لاتكتبوا غير القرآن، ومن كتب شيأ غيره فاليمحه)، بۆیە نووسینەوەی قورئان بە فەرمانی پێغەمبەر بووە، ئەوەتا زەید دەفەرمووێت: هەر ئایەتێك دابەزی پێغەمبەر دەینارد بەدوامداو دەیفەرموو ئەم ئایەتە بنووسە.

**قۆناغی دووەم:** قۆناغی کۆکردنەوەی قورئانە، ئەویش لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەر پێشنیاری عومەری کوڕی خەتابدا بوو (خوا لێی ڕازی بێت)، لە کاتی شەڕەکاندا ئەوانەی قورئانیان لە بەربووە زۆرێکیان لێشەهید بووە، بۆیە پێشنیازی کۆکردنەوەی قورئانی کرد.

**قۆناغی سێیەم:** قۆناغی کۆپی کردنی قورئانو یەکخستنی بوو، کە لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا کرا، لە ڕووی فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامیی، کۆپیان کرد، ئەوەبوو عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) ناردی بۆ لای حەفصەی خێزانی پێغەمبەر کە ئەو پەڕە قورئانانەی کە لاتە بۆمان بنێرە با چەند دانەیەکیان لێبنووسینەوەو لە یەك پەڕاودا کۆی دەکەینەوەو بۆتی دەنێرینەوە، پاشان حەفصە ناردی بۆیان، عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت) زەیدی کوڕی سابتو عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصو عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشامی ڕاسپارد

[1] المنجد ص243.

بەیەککخستنەکە، فەرمانی پێکردن کە ئەگەر خیلاف لە سەر جۆری نووسینەکان هەبوو بە زمانی زەید بینووسین، چونکە ئەم قورئانە بە زمانی قورەیش دابەزییوە[1].

پاشان عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت)، چوار کۆپی لێکردو هەریەکەی نارد بۆ کوفەو بەسراو شامو چوارەمیشی لای خۆی هێشتەوە[2] ئەمەی پێشوو سەبارەت بە قورئان، بە شێوەی گشتیی، بەڵام بەشێوەی ڕیزبەندی سورەتو ئایەتەکان دوو بابەتی جیاوازن، ڕیزبەندی سورەتەکان هاوەڵانی پێغەمبەر کردویانە، لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففانداو بابەتێکی ئیجتیهادیو، تەرتیبی ئایەتەکان بۆ ناو سوورەتەکان بابەتێکی تەوقیفییەو بە فەرمانی حەزرەت کراوە، ئەوەتا: عوسمانی کوڕی عەففان دەفەرمووێت: هەرکاتێك ئایەتێك بهاتایەتە خوارێ بانگی نووسەری وەحی دەکردو دەیفەرموو ئەم ئایەتە بخەنە فلانە سورەتەوە[3]، چونکە قورئان پێشئەوەی دابەزێتە سەر زەوی بەکۆی نووسراوی لە (لوح المحفوظ)دا هەیە، پاشان نێردراوەتە ئاسمانی دنیا، پاشان بەش بەشو ئایەتو چەند ئایەت نێردراوەتە سەر زەوی، بەپێی بەڵگەی قورئانیی:

1. (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ).
2. (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ).
3. (وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً).

سەبارەت بەوەی کە نووسەر خۆی گێل دەکات دەڵێت: "بۆچی بەپێی مێژووی هاتنە خوارەوەی دایان نەڕشتووە"، لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

1. بڕیاری سەرجەم هاوەڵانە، کە قورئان بەوشێوەیە تەرتیب بکەن، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژیانیدا دەستووری پێدابوو.
2. سوورەتەکانی قورئان بەیەك بەش دانەبەزیوە، هەندێجار یەك ئایەتو هەندێکجار زیاتر لە ئایەتێك لە چەند سوورەتێك دابەزیوە.
3. سورەتمان هەیە مەکیەو ئایەتی مەدەنی تێدایەو بە پێچەوانەشەوە.

بۆیە نووسەریش ئەم ڕاستییە دەزانێت، بۆخۆی لە ڕاستییەکان لادەدات، دەبێت هەرخۆی وەڵام بداتەوە.

<u>**ڕەخنەی یازدەهەم:**</u> نووسەر پانئێرانیزمیی خۆی ئاشکرا دەکاتو وەرگێڕیش بۆی نەقڵ دەکات، لە پ1، لا 47، دێڕی (1-3) "ئاین بەمانا ڕاستەقینەکەی خۆی ڕەگو ڕیشەیەکی پتەوی لە ناو عەرەبی خەڵوەتنشیندا نییەو هەتا ئێستاش گوێ نادەنە مەسەلە ڕوحانییەکانو هێزی ئەودیو سرووشتەوە، زۆر بەلایانەوە گرنگ نییە، خەڵکێکی هەژار لە وڵاتێکی وشكو بێبەرەکەتدا دەژینو جگە لە هەندێك ڕەوشتو دابو نەریت هیچ سیستمێکی کۆمەڵایەتی بەسەریاندا زاڵ نییە".

ئەم ڕەخنەیە وامان لێناکات ببینە وەکیلی بەرگریکاری عەرەبو بیسەلمێنین کە عەرەب خاوەنی سیستمێکی بەهێزی کۆمەڵایەتیی‌بوونو هەنو لە هەمانکاتیشدا[4]، ستەمکاریو قین لە دڵی نووسەری پانئێرانیزم وامان لێناکات لە دژی سیستەمو فەرهەنگی فارسی قسەبکەینو بەکەمی بزانین، هەر بۆیە هەوڵدەدەم بە ئەندازەیەك هاوسەنگ بمو باسی سیستمی کۆمەڵایەتی هەردوولا بکەم.

ئەوەی جێگەی تێڕامانەو مێژوونووسانیش جەختی لە سەر دەکەن، ئەوەیە کە نیشتمانی عەرەبی جێگەی چەندین شارستانیەتی کۆنو سیستمی جیابووەوەو بەهەمان شێوەش وڵاتی فارس، هەر ئەمەش بووە وای کردووە چەندەها سیستمی کۆمەڵایەتی سادەو ئاڵۆزی لە خۆگرتووە.

---

[1] نفس المصدر، ص240.

[2] البرهان في علوم القرآن، محمد بن بهادر بن عبدالله الزكشي، ج1، ص236، 1970.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو ص234.

[4] چونکە خودی نووسەر لە پ5،لا5، دێڕی (1) دەنووسێت "لەمانەش خراپتر ئەوەیە کەسێك دەیەوێت سیستمی کۆمەڵایەتی ئەوان تێكو پێك بدات.." نووسەری بەڕێز ئەمە ئەگەر هەبێت درۆی خۆتە، ئەگەرنا بۆ لێرەدا تێکدانی سیستمی کۆمەڵایەتی قورسەو ئەگەر نییە بۆچی بیەوێت تێکی بدات؟.

بەبڕوای ئێمەی بڕواداران بە ئایین، سەرزەوی لە لایەن پیاوانی خوداوە ئاوەدانکراوەتەوەو شەڕەنگێزان‌و خراپەکاران لە ئەنجامی ململانێدا مرۆڤایەتیان بەڕێگەی دژوارو قەیران‌و ئاڵۆزدا بردووە، ئەمەش بەتەنها خەڵکی جیا لە ئایین نەیکرووە، بەڵکو هەندێ جار بەهۆی لادانی بڕوادارانەوە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکە تێکچووەو ئاڵۆز بووە، بۆیە دەڵێم ئەو شارستانیەتەی کە فارس شانازی پێوە دەکات‌و سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بۆ بەرهەم هاتووە لە ئەنجامی ئەو شارستانیەتەدا سەرچاوەکەی لە ماوەیەکی کەم‌و نزیکدا زەردەشت بووە کە ئەویش لە ئایینەوە سەرچاوەی گرتووەو پاشانیش بووەتە ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییە بەهێزەو توانیویەتی بە هۆیەوە هەموو فارس یەکبخات‌و ناوچەکە کۆنترۆڵ بکات، بە بەشێکی زۆری وڵاتی عەرەبییەوە.

ئەوەش ڕاستە لەبەر نەبوونی سیستمێکی کۆمەڵایەتی بەهێزی هاوزەمان لە گەڵ فارسدا عەرەبی لاواز کردووەو وای لێکردوون کە ببنە تۆزی ناو دڕك، تاوایان لێهاتووە بوونەتە نێچیرێکی توك نەرم‌و هەردوو ئیمبراتۆرییەتی فارس‌و ڕۆم دەسەڵاتی تەواویان بەسەریاندا هەبووە، بەڵام:

پاش هەڵهاتنی خۆری ئیسلام‌و دامەزراندنی سیستمێکی کۆمەڵایەتی بەهێزو زیندووکردنەوەی ئەو بەشەی کە چاك بووە ئاوێزانبوونیان لە گەڵ ئایندا، بوونەتە بەهێزترین سیستمی کۆمەڵایەتی‌و نەفارسی ساسانی‌و نەڕۆمی بیزەنتی لە بەردەمیاندا خۆیان ڕانەگرتووە، هەردووکیان هەرەسیان هێناوە، کە واتە جێگەی خۆیەتی بڵێین سەرچاوەی هەرسێ سیستمە کۆمەڵایەتییەکان لە هەموو قۆناغە بەهێزیەکانیاندا ئایین بووەو سەرچاوەی ئەوەی فارس زەردەشتی بووەو ئەوەی ڕۆم مەسیح بووەو ئەوەی عەرەب موسڵمانییەتی بووە، ئەوەشی کە نووسەر دەیڵێت سەبارەت بە نەبوونی سیستمی کۆمەڵایەتی لە ناو عەرەبدا نەبوونی ئاین بووە، ئێستاو ماوەیەکیش لە مەوبەر هۆی بوونی ئاین بووە، عەرەبیش لە هەموو کەس زیاتر ئایین ڕەگ‌و ڕیشەی تێدا داکوتین، ئەویش بەڕێژەی جۆراوجۆرو بۆ ماوەی جیا جیا.

بۆ یادخستنەوەش ئەو بەرنامەیەی کە نووسەر زۆرتر پێی موعجەبە کە کۆمۆنیستیە پاش بڵاوبوونەوەی لە لانکەی خۆیداو پەلڕاکێشانی بۆ ناوچەی عەرەبی زۆر خۆی ڕانەگرت‌و ئەوەتا (100) ساڵی بەسەردا تێنەپەڕی بارگەوبنەی پێچاوەتەوەو هەڵگرانی هەر ڕۆژە بە عەبایەکەوە عەرزی دەکەنەوە بەشەرمەوە، لە بەرامبەردا ئایینی ئیسلام (1400) ساڵ زیاترەو ئێستاش هەوڵی جدی هەیە لەم ساتەوەختانەی ئێمەدا بۆ دووبارە پیادەکردنەوەی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییە.

<u>**ڕەخنەی دوانزەهەم:**</u> پ6، لا51، دێڕی (1–3) "وەرەقەی کوڕی نوفل ئەگەرچی خۆی نەببووە مسوڵمان، بەڵام پشتگیری لە موحەممەد دەکردو پێشنیاری بۆ پێغەمبەر کردبوو کە : داوا لە ئەبوبەکر بکات ببێتە ئیسلام".

سەرەتا نازانم نووسەر دەقەکەی وانووسیوە، یان وەرگێڕ سەقەت وەری گێڕاوە، بەهەرحاڵ ئەگەر هەرکامیان نووسیبێتی بەڕاستی کارەساتە، کەسێك بانگەشەی نووسەری‌و ڕۆشنبیریی بکات، ئیسلام‌و مسوڵمان لە یەك جیانەکاتەوە، کە ئیسلام دینەکەیەو مسوڵمانیەتیش ئیذتمایە، نووسەر دەڵێت کە "داوا لە ئەبوبەکر بکات بێتە ئیسلام".

پاشان نووسەر هیچ بەڵگەیەکی نەهێناوەتەوە لە سەر مسوڵمان نەبوونی وەرەقەو ڕەشۆکیانە دەڵێت: "بەڵام پشتگیری لێکرد"، چونکە ئاگای لە مێژووی ئیسلامەتی نییە، ئەوەتا ئیبن هیشام لە کتێبەکەیدا باسی هەڵوێستی وەرەقە دەکات بەرامبەر بە حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) دەڵێت: "پاش ئەوەی حەزرەت وەحی بۆ هات‌و پاشان بەوشێوەیە گەڕایەوە، بۆ ڕۆژی دوایی وەك خوی جارانی چوو بۆ تەوافی کەعبەو لەوێ بەوەرەقەی کوڕی نەوفل گەیشت‌و وەرەقە لێی پرسی ئەی برازام بۆم بگێڕەوە چیت بینی‌و چیت بیست؟، پاش ئەوەی حەزرەت بۆی گێڕایەوە وەرەقە وتی "سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، تۆ پێغەمبەری ئەم ئوممەتەی‌و چیت بۆ هاتووە؟" پاش ئەوەی بە حەزرەت دەڵێت دووچاری ئەو شتانە دەبێت، دەڵێت "ئەگەر ئەو ڕۆژەی کە وات لێدەکەن من زیندوو بووم ئەوا پشتیوانیت لێدەکەم پاشان سەری لە سەری حەزرەت نزیك دەکاتەوە ناوچەوانی ماچ دەکات"[1].

[1] سیرة إبن هشام، ص238، ج1.

ئەگەر کەسێك هەموو ژیانی بەدوای حەقیقەتدا گەڕابێت و زانیبێتی ئەو ڕاستەقینەیە هاتبێتە بەردەستی، نەفامانە نییە بڵێی باوەڕی پێنەهێناوە؟ لە کاتێکدا ئەو دووپاتی دەکاتەوە کە پشتیوانی دەکەم و سەری ماچ دەکات، لە لایەکی دیکە قسە لەوە ڕاشکاوانەتر ئەمەیە کە وەرەقە باسی دەکات لە چەند دێڕە شیعرێکدا سەبارەت بەم ئایینە تازەیە، کە پاش ئەوەی خەدیجە باسەکەی حەزرەتی بۆ دەگێڕێتەوە ئەویش بە لەسەرخۆییەکەوە دەڵێت، هەتا کەی و ئەم چەند بەیتە دەڵێت:

لججت وكنت في الذكرى لجوجا لهم طالما بعث النشيجا

ووصف من خديجة بعد وصف فقد طال إنتظاري يا خديجا

ببطن المكتين على رجائي حديثك أن أرى منه خروجا

پاشان دەڵێت:

فيا ليتي إذا ماكان ذاكم شهدت فكنت أولهم ولوجا[1]

پاش ئەوەی وەرەقەی کوڕی نەوفل چاوی بە پێغەمبەر کەوت بۆ ڕۆژی دوایی، پێیوت "من شاهیدی دەدەم کە تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ) کە مژدەت دراوەتێ هەمان مژدەیە کە دراوە بەکوڕی مەریەم و لە سەر ڕێڕەوی موساو عیسایت و تۆ پێغەمبەری نێردراوی"، هەروەها لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە کە حاکم گێڕاویەتییەوە (کە وەرەقەم بینی لە بەهەشتدا...)، ئەم فەرموودەیە لە بارەی وەرەقەوە حەزرەت فەرموویەتی[2] .

پاش ئەمانەش ئەوەی کتێب بێت و لەم دەڤەرەی خۆماندا بەردەستم کەوتبێت لە (السيرة النبوية، البداية والنهاية، الكامل في التأريخ، تأريخ الخلفاء)و چەند کتێبێکی دیکە کە هەندێکیان لەسەر (سی دی) بوون هیچیان باسی هیچ پێشنیازێکی وەرەقە ناکات بۆ حەزرەت بۆ ئەوەی داوا لە ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) کە مسوڵمان بێت، بەڵکو لەبەرناسین و هاوڕێیەتی و ناسراوی ئەبوبەکرە حەزرەت یەکەم کەس پێشنیازی مسوڵمان بوونی دەخاتە بەردەست و ئەویش ڕاستەوخۆ لەبەر زانستی پێشینەی بەم ئایینەو بەکەسایەتی ڕاستگۆیانەی حەزرەت، ئیمان دەهێنێ و دەبێتە یەکەم کەس لە پیاواندا کە باوەڕ دەهێنێت.

<u>**ڕەخنەی سیازدەهەم:**</u> پ2، لا53، دێڕی (6-7) کە دەڵێت "داوایان لێکرد (مەبەستی ئەبوتالیبە) کە هەوڵ بدات موحەممەد لەم کارەی پەشیمان بکاتەوەو لە بەرامبەردا ئەوان لە ماڵی کەعبە پلەو پایەیەك دەدەن بە موحەممەد".

سەرەتا زۆر گەڕام تا بزانم نووسەر مەبەستی لە کام سەفەرەیە کە قوڕەیش چووبن بۆلای مامی حەزرەت و ئەم داواکاریەیان لێکردووە، چونکە نووسەر وای زانیوە تەنها ئەو دەتوانێت قسە بکات و ڕووداو نەقڵ بکات و پێشم وایە بیری لەوە نەکردووەتەوە کە ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبێتەوە، چونکە هەرچی سەرچاوەی ئیسلامیی باوەڕپێکراو هەیە بەزمانی عەرەبی نووسراون، خەڵکیش بەو شێوەیە شارەزا نییە تا درۆکانی ئاشکرابن، پاش گەڕانەوەم بۆ سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامیی بۆم دەرکەوت کە قوڕەیش چەند جارێك سەردانی مامی حەزرەتیان کردووە، بەڵام لە هیچیاندا پێشنیازی ئەوەیان نەکردووە کە پلەو پایەیەك لە ماڵی کەعبە بدەن بە پێغەمبەر (ﷺ)،!! هەربۆیە پاش ئەوەی حەزرەت باسی خواکانی قوڕەیشی کردو حەقیقەتی خستنە ڕوو قوڕەیش پێیان ناخۆش بوو وەفدێکیان کۆکردەوە کە پێکهاتبوون لە (عتبە، شيبه، أبو سفيان، أبو بختري (عاص بن هاشم)، أسود بن المطلب وأبوجهل وليد بن المغيرة وعاص بن وائل)و چەند کەسێکی تر چوونە لای ئەبوتالیب، وتیان: برازاکەت قسە بەخواکانمان دەڵێت، یا دەبێت پێی بڵێیت واز بهێنێت، یان وازمان لێبهێنە ئێمەو ئەو.

پاش ئەوەی شکستیان هێنا لە بەرامبەر ئەم هەوڵەدا دووبارە چوونەوە بۆ لای مامی حەزرەت و دووبارە پێیان وتەوە: "ئەی ئەبو تالیب تۆ تەمەنێکت هەیەو پیاوێکی بەڕێزی، شوێنی تایبەتت هەیە لە ناوماندا، داوامان لێکردی کە برازاکەت

---

[1] السيرة النبوية، ابن هشام، ص192، ج1.

[2] شرح الشفا: ئەم کتێبە شەرحی کتێبی (الشفا بتعريف حقوق المصطفى)، (القياض عياض) یەو مەلا عەلی قارئ شەرحی کردووە ناونراوە شرح الشفا، ص734، ج1، ط الاولى 2001م.

واز پێبهێنیت، بەڵام نەتکردو ئێمەش ئارام ناگرین لەسەر قسەوتن بەخواکانمان، یان دەبێت وازبهێنێت، یان ئێمەو ئەو لەگەڵ تۆشدا بابەرامبەرکێ بکەین، تا یەکێك لەم دوو تیمە تیا دەچن، پاشان ئەبوتالیب ئەمەی لا ناڕەحەت بوو، حەزرەتی بانگکردو پێی وت: ئەی برازاکەم، ئەوەتا هۆزەکەت هاتوون و ئەمەیان پێووتووم، منیش و خۆشت بهێڵە، دووچاری شتێکم مەکە کە توانام نەبێت، پاشان حەزرەت ئەو قسە بەناو بانگەی کرد "سوێند بێت بەخوا ئەگەر خۆر بخەنە دەستی ڕاستمو...تاد"[1]

ئەوەی کەنووسەر باسی دەکات و لەخۆشی و خوێنەرانیشی تێکداوە بەمشێوەیە بوو پاش ئەوەی قوڕەیش سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا لە ڕێگەی ئەبوتالیبەوە، شێوازی دیکەیان گرتەبەر.

**سەرەتا:** جارێکیان عوتبەی کوڕی ڕەبیعە لای کۆمەڵی قوڕەیش دانیشتبوو و پێغەمبەریش(ﷺ) لە لای کەعبە بە تەنها دانیشتبوو، عوتبە بە سەرۆك هۆزەکانی وت: "هەڵسم و قسە لەگەڵ موحەممەد بکەم و هەندێ بەڵێنی بدەمێ، بەڵکو قەبوڵی بکات و لە کۆڵمان ببێتەوە" پاشان هەڵساو ئەم پێشنیارانەی کرد بۆ حەزرەت، "ئەی برازاکەم ئەگەر ماڵت دەوێت بۆت کۆدەکەینەوە، تا دەبیتە دەوڵەمەندترینمان، ڕێزو تەقدیریت دەوێت دەتکەین بە گەورەی هەموومان و هیچ کارێك ناکەین بەبێ تۆ، خۆ ئەگەر دەتەوێت بتکەین بە پاشا ئەوە تۆ پاشامان بە، ئەگەر نەخۆشی و دەزانی جنۆکە چۆتە لەشتەوە ئەوا پزیشکت بۆ بانگ دەکەین".

دوای ئەم ڕووداوەو پێشنیازەی عوتبە، قوڕەشیش وەفدێك پێکدەهێنێت قسە لەگەڵ حەزرەت دەکەن و هەمان پێشنیازی دەخەنە بەردەست، بەڵام وەڵامی هەریەکەیان بەجۆرێك دەداتەوەو باسەکەش لە کتێبەکە مێژوویەکاندا هاتووە[2].

لەمەوە دەردەکەوێت تا چەند نووسەر بە ئەمانەتەوە مێژووی نەقڵ کردووەو باسەکانی بە جوانی کردووە!، ئەگەر نا لە کاتی ئەم پێشنیازانەدا، باسی ئەبو تالیب نەکراوەو نەهاتووە، هەربۆیە دەڵێم نووسەر هەرسێ ڕووداوەکەی مۆنتاج کردووەو یەك دەقی لێ دەرهێناوە، وەك نووسەرێکی شانۆکار، یان دەیەوێت فلیمێك بنووسێت و شتەکان بە کورتی بنووسێت، تۆ بڵێی نەبوونی سەرچاوە زۆرجار لە بەرئەوە نەبووبێت کە نووسەر لە بینینی فیلمێکەوە ئەمانەی نەقڵ کردووە.

ئەمەی سەرەوە ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی مۆنتاژکراوی نووسەر بوو، بەڵام زۆر جارنووسەر باسی زیرەکی حەزرەت دەکات کە مەبەستیەتی، ئەگەرنا مەسەلەکە زیرەکی بێت مەسەلەی وەحی و پێغەمبەرایەتی نەبێت زۆر ئاسان دەبوو پێغەمبەر (ﷺ) یەکێك لەو پێشنیازانە هەڵبژێرێت بە تایبەت پاشایەتییەکە، بەهۆی ئەوەی کە دەبێت بە قسەی بکەن، هەموویان ناچار دەبوون بەرواڵەتیش بێت پەیڕەوی لە قسەی مەلیکەکەیان بکەن و ئەویش بە ئاسانی دەیتوانی پابەندیان بکات بە ئیسلامەوە، ئەمە لە لایەك لە لاکەی ترەوە ئەگەر موحەممەد (ﷺ) بیویستایە دارایی هەموو قوڕەیشی دەست بکەوێت و پاشان کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکات ئەوا زۆر ئاسانتر دەبوو، کە ئەو هەموو نەهامەتییەی بەسەرخۆی و هاوەڵانی هێنا تا گەیشتن بە دەسەڵات، خۆ دەبوایە نووسەر عەقڵی بەوە بشکایە کەسێك بکرێتە پاشاو سەروەتی هەموو هۆزەکانی لە بەردەستدا بێت بۆ دەبێت قەبوڵی نەکات، پاشان ئەوەی دەیەوێت بەدەستی دەهێناو ئەوەندەش ناڕەحەت نەدەبوو، تەنها ئەوە ماوەتەوە بڵێین ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە کە حەزرەت لە خواوە ڕێنموونی دەکراو پێشنیازی ئەوانیشی وەك وەحی قەبوڵ نەبوو.

**ڕەخنەی چواردەیەم:** پ1، لا54، دێڕی (1 –5) "هەر ئێرانییەك کە دەرك و دیواری ماڵەکەی موعجیزەی لێدەبارێت و هەر ئیمامزادەیەك (تەنانەت بێ ناونیشان و نەناسراویشە) کە بەردەوام موعجیزە دادەتاشێت، بەڵام کاتێك سەیری قورئان دەکات سەرسام دەمێنێت لە کاتێکدا کە هیچ جۆرە نیشانەوە شوێنەوارێك لە موعجیزەو پەرچوو لە قورئاندا نییە".

---

[1] السيرة إبن هشام، ج1، ص264 – 266.

[2] هەمان سەرچاوە، ج1، ص293– 296.

ئەمەی سەرەوە دەقی پەرەگرافێکە کە نووسەر لە ژێر مانشێتی (موعجیزە)دا هێناویەتی، بەبڕوای من نووسەر واتێگەیشتووە قورئان وەك کتێبەکەی (جێنز) وایە پڕە لە عەجایبات و شتی سەرسوڕهێنەرو داهێنانی سەیرو سەمەرەی تەکنەلۆجیا!! لە بیری کردووە، یان لە بیری خۆی بردۆتەوە کە قورئان بەرنامەی ژیانی مرۆڤەو لە واقیعێکدا هاتووە کە زەمەن و زەمینەی خۆی هەبووە، خەڵکی خۆی هەبووە، عەقڵی ئەوان لەو سەردەمەدا تەقەبوولی چی دەکات، دەبێت قورئان تا چ ئەندازەیەك گوتارێکی عەقڵی بێت کە ڕوو لەو خەڵکانە بکات کە لەو سەردەمەدا دەژین و گشتگیریش بێت، لە هەمانکاتدا بۆ سەر زەوی و لە هەموو کات و سات و شوێنێکدا بۆ هەموو مرۆڤەکان، هەر بۆیە دەمەوێت کە مێك لە وشەی موعجیزە بدوێم، موعجیزە لە زمانی عەرەبیدا (أمر خارق للعادة، یعجز البشر عن أن یأتوا بمثله)، واتە کارێك کە لەباری ئاسایی بەدەربێت و بەشەرەکان بێتوانایی خۆیان نیشان بدەن لە بەرامبەریدا[1] .

کەواتە هەرشتێك مرۆڤەکان نەتوانن وەك ئەوە بکەن ئەوە موعجیزەیە، چ کردار بێت، یان گوفتار، بەمەرجێ ئەو کردارو گوفتارە لە یاسای ئاسایی سەرزەوی بەدەربێت.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوەدا وا تێدەگەم کە نووسەر زۆر بە هەڵەدا چووبێ، چونکە هەرچۆن مارکسییەکان پەست بوون لە و هەموو خورافاتەی کە خراونەتە نێو ئاینی مەسیحییەوەو لە ئەنجامدا سەرجەم ئاینەکان بە تلیاکی گەلان ناوزەد دەکەن، ئاواش نووسەر لە خورافاتی شیعەی ئێرانییەوە بێزار بووەو هەموو موعجیزەیەکی لابۆتە ئەفسانەو درۆ، چەندەش مارکسییەکان بەهەڵەدا چوون ئاوەهاش نووسەر لە هەڵەدا گەوزاوە. چونکە ئاین لە ڕوانگەی شیعەی ئێرانییەوە ناپێورێت، بەڵکو لە میانەی دەقە باوەڕپێکراوەکانی ئیسلامەوە دەپێورێت. ئەوەش کە باسی ئیمامزادەکان دەکات، لە ئیسلامدا شتێك نییە بەوناوەوە کە لە ئیسلامدا جێگەی ببێتەوە. سەبارەت بە موعجیزەش زۆر بەشێوەیەکی کەم لە قورئاندا باسکراوەو لە ژیانی حەزرەتدا هاتووە، ئەوەش داوای موعجیزەی کردووە لە پاشماوەی ئاینی یەهودی و مەسیحی بووە، بەشێکی گەشتووەتە دەمی سەرانی قورەیش، چونکە سەردەمی موعجیزە لە سەردەمی پێغەمبەرانی پێش کۆتا پێغەمبەریشدا بووە، وەك عیساو موسا (سەلامی خوایان لێبێت)، سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام سەردەمی خیتابی عەقڵی بووەو سەردەمی بەلاغەت و مەنتیقی جوان بووە، بۆیە قورئان لە سی شوێندا تەحەدای کافران دەکات کە وەك ئەم قورئانە بهێنن کە نەیانتوانیوەو ناشتوانن، دەبێتە گەورەترین موعجیزەی حەزرەت (ﷺ).

**ڕەخنەی پازدەهەم:** خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت (أفلا یتدبرون القرآن ولو کان من عند غیر الله لوجدوا فیه إختلافا کثیرا) ئایەتی (82) سورەتی (النساء)، ئەمە یەکێکە لەو موعجیزانەی کە قورئان باسی لێوە دەکات و نووسەریش بەدوایدا دەگەڕێت، خودی نووسەرو وەرگێڕیش ئەمەیان سەلماندووە، ئەوەتا لە پ2، (54)، دێڕی (1) دەڵێت "زیاتر لە 20 بابەت لە قورئاندا هەیە کە نکوڵیلێکەرانی ئیسلام داوای موعجیزەیان لە موحەممەد کردووە".

هەروەها لە پ7، لا56 دێڕی (5) دەڵێت "بەردەوام زیاتر لە بیست و پێنج جار ئەم بیانووگرتن و موعجیزە خواستنە لە پێغەمبەر لە سورەتەکانی مەکیدا هاتووە".

ئەگەر بەوردتر سەیری نووسەر بکەیت لەوە سەیرترە کە دیارە، بۆ نموونە کە دەڵێت زیاتر لە (20) بابەت هەر لە (4) ئایەتی سورەتی (الاسراء)دا (9) بابەت داواکراوە کە موعجیزە بهێنرێتەوە، پاشان سەرجەمی ئەو ئایەتانە نووسەر بەبەڵگە هێناونیەتەوە ژمارەیان (18) ئایەتن، لە هیچ بارێکدا باسی (25) جار، نە لە بابەتدا نە لە ئایەتدا دیار نییە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە نووسەر بابەتەکەی خۆی نەخوێندۆتەوە پاش تەواوبوونی، یان لای گرنگ نەبووە کە چی تێدایە، گرنگ ئەوەیە حەقی خۆی دەست بکەوێت.

**ڕەخنەی شازدەهەم:** پ1، لا85، دێڕی (1–3) "بەڵام بە مردنی موحەممەد هەموو تایبەتمەندییە بەشەرییەکانی لێوەردەگیرێتەوە، ڕۆژێك پاش مردنی موحەممەد (عومەر) یان یەکێك لە ئەسحابە گەورەکان شمشێر هەڵدەکێشێت و هاوار دەکات کە هەرکەسێك بڵێت موحەممەد مردووە بەم شمشێرە لە ملی دەدەم".

[1] المنجد، لویس معلوف، ص488.

نووسەر پێی وایە ئەگەر مرۆڤ درۆ بکات یا درۆی شاخدار بکات، ئەگەرنا ئەمەی نەدەنووسی، سەرەتای پەرەگرافەکەی باسێکە کە هەموو عەقڵ سادەیەك دەزانێت ئەمەی نووسەر پێچەوانەی عەقڵە، چونکە موحەممەد (ﷺ) مرۆڤە، لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤیش مردنە، کەواتە مردنی حەزرەت تایبەتمەندییەکەی لێوەرنەگرتووەتەوە، بەڵکو ئیسپاتی کردووە، پاشان سەبارەت بە بەشی دووەمی پەرەگرافەکەی، هەر لە ڕێگەوە دیارە نووسەر هیچی بەلای نووسینیدا ناچێت، ئەگەرنا هەر نووسەرێك کە ڕووداوێکی مێژوویی نەقڵ دەکات هەوڵ دەدات وەك خۆی، یان ئەگەر چەند ڕایەك هەبوو کامیان نزیکە لە بەڵگەو مەنتیقی عەقڵەوە، ئەوەیان نەقڵ بکات. خەڵکی سادە دەزانن ئەو کە سەی کە مردنی حەزرەتی پێ قەبوڵ نەدەکرا عومەری کوڕی خەتتاب بوو، بەلاّم ئەم مێژوونووسە شارەزایە ئەم کتێبەی نووسیوە ئاگای لێ نییە کام لە هاوەڵە گەورەکان بووە عومەر، یان یەکێکی تر. خاڵێکی تر، نووسەر لەوە دەچێت ئاگای لە واقیع نەبێت، مردنی حەزرەت بۆ دەبێت دوای ڕۆژێك بگاتە عومەر، ئەمە گێلیە، یان خۆگێل کردنە، دوو سەرچاوەم سەیرکرد کە (البداية والنهاية، السيرة النبوية) هەردووکیان باسی ئەوە دەکەن کە عومەری کوڕی خەتتاب لە گەڵ موغیرەی کوڕی شوعبە لای پێغەمبەر بوون، عومەری کوڕی خەتتاب کە دەبینێت حەزرەت لە هۆشی خۆی چووە دەفەرموویێت: چەند لە هۆش چوونەکەی بەهێزە، پاشان کە هەڵدەسن و دەڕۆن، کە نزیك دەبنەوە لە دەرگای دەرچوون، موغیرە دەفەرموویێت: ئەی عومەر پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردووە، عومەر پێی وت: درۆ دەکەی، تۆ پیاوێکی حەزت لە فیتنەیە، پێغەمبەر نامرێت هەتا دووڕووەکان لە ناو نەبات، پاشان دەستی بەوتاردان کردو دەی وت: پێغەمبەر نامرێت. پاشان هەواڵەکە بە ئەبوبەکر دەگات، کە دەبینێت حەزرەت کۆچی کردووە، دەچێتە سەر مینبەر دەفەرموویێت: هەرکەس موحەممەدی پەرست ئەوا موحەممەد کۆچی کرد، ئەوەی خوا دەپەرستێت ئەوا خوا زیندووەو نامرێت. ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە (إنك ميت وإنهم ميتون) (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل، أفإن مات أو قتل إنقلبتم على أعقابكم...)[1]

پاشان عومەر دەفەرموویێت: سوێند بەخوا وامزانی ئەم دوو ئایەتە دانەبەزیبوون هەتا ئەبوبەکر خوێندیەوە، پاشان کەوتمە زەوی و قاچەکانم هەڵیان نەگرتم، لە وێدا زانیم کە حەزرەت کۆچی کردووە.[2]

__ڕەخنەی حەڤدەهەم:__ پ2، لا85، دێڕی (3-5) دەڵێت "واتە ئەو دوو تایبەتمەندییەی کە خودی موحەممەد بۆ خۆی دایدەناو لە پێنج فەرزەی نوێژو ئایەتەکانی قورئاندا باسی کردووە"

سەرەتا ئەو دوو تایبەتمەندییە بریتین لە (إنما أنا بشر) لە گەڵ (يوحى الي)، لەم پەرەگرافەدا یەك خۆزگەم هەیە، خۆزگە نووسەر، یان وەرگێڕ جارێك نوێژیان کردبێت، یان گوێیان لێ بووبێت کە سێ نوێژی کردبێت، یان لە کەسیان بپرسیایە لە نوێژدا چی دەوترێت.

گومانم نییە لە وەی نوێژیان نەکردووە، ئەگەرنا دەبوایە بیانزانیایە کە ئەم دوو تایبەتمەندییە لە یەك فەرزەی نوێژدا نین، نەك لە پێنج فەرزەدا، لە کە سیشیان نەپرسییوە ، ئەگەرنا پێیان دەوتن کە ئەم دوو ئایەتە تایبەتمەندە لە نوێژدا نین.

دەکرێت بڵێم نووسەر گوێی لە ئیمامێك بووبێت نوێژی کردبێت لەدوای سورەتی فاتیحە ئەو ئایاتەی کۆتایی سورەتی (الكهف)، یان هەر سورەتێك کە ئەو دوو تایبەتمەندیەی باسی دەکات خوێندبێتی و لای نووسەر بووە بە فەرزی پێنج نوێژە.

شتێکی دیکە کە زۆرجار بێزارم دەکات، ئەوەیە کە هەندێك خەڵکی مسوڵمان و شارەزا لە ئیسلام باس لە بەرنامەی عەلمانییەت و کۆمۆنیستی و دەکەن، بەبێئەوەی ئاگایان لە وردەکاری ئەو بەرنامانە هەبێت، بەهەمان شێوە ئەو خەڵکەی کە شارەزاییان نییە لە فەرزەکانی نوێژداو هەڵدەگڕن بە ئایینی ئیسلامداو ڕەشۆکیانەو نەزانانە دەکەونە بەڵگە هێنانەوەی بێ سەروبەر، نووسەریش وا دەردەکەوێت یەکێکە لەوانەی کە هەڵگژاوە بە پێغەمبەری ئیسلامداو دڵنیا بێت پێغەمبەر (ﷺ) وەك مانگ وایە لە دیاریداو، ئەمیش لە زەویە، بە ڕووناکییەکەی بێ تاقەت بووە.

[1] السيرة النبوية، ج4، ص655-656، لابن هشام.

[2] البداية والنهاية، ج5، ص241-242، لابن الاثير.

**ڕەخنەی هەژدەیەم:** پ2، لا85 دێڕی (1–6) "بەتێپەڕبوونی کاتو زەمانی زیاتر بەسەر مەدینەی ساڵی یازدەی کۆچیدا، هێزی گومانو خەیاڵاتی مسوڵمانان زیاتر دەکەوێتە گەڕو پێداهەڵدانو ...(لولاك لما خلقت الافلاك)...".

هەمیشە ئەوانەی کەشت دەنووسن وا بیردەکەنەوە کە زانیاریەکی زیاتریان پێیەو دەیگەیەننە چینێکی خوار خۆیان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە نووسەران دەبێت لە بابەتی نووسینەکانیاندا شارەزاترو ڕۆشنبیرتربن لە خوێنەرانی نووسینەکانیان، بەڵام ئەم نووسەرەی ئێمە بیری لە وە نەکردووەتەوە کە دەبێت شتێك بنووسێت بچێتە عەقڵەوە، لە نەقڵکردنی ئەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێت کە نووسەر چەند بێئاگایە لە زانستی شەرعییو ڕۆشنبیری ئیسلامیی، دەنا دەبوایە ئەم فەرموودە هەڵبەستراوەی بە ئەمانەتەوە نەقڵ بکردایە، هەربۆیە خاڵی یەکەم بیزانیبایە فەرموودە لە زانستی شەرعیدا کەی نەقڵ دەکرێتو چۆن نەقڵ دەکرێتو مەرجی قەبوڵکردنی چییە؟، لە بابەتی پێشوودا خۆزگەیەکم باس کرد، ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە خۆزگە دەسەڵاتێك هەبوایە نەیهێشتایە، خەڵکی شارەزای ئیسلامیی، قسە لەسەرشتی نا ئیسلامی بکەن کە تیایدا شارەزانین، بەهەمان شێوەش نەهێڵن خەڵکی شارەزایی نا ئیسلامیی دەستکاری شتی ئیسلامیی بکەن، چونکە بەبڕوای من هەردووکیان تێکیدەدەن. سەبارەت بەم فەرموودەیە کە نوسەر نەقڵی کردووە، یەکێکە لەو فەرموودە هەڵبەستراوانەی کەزانایانی ئیسلامی خوێندەوارانیان لێ ئاگادارکردووەتەوە، نووسەریش زۆرجار شیکردنەوەی عەقڵیی بۆ ئایەت ڕووداوە مێژوو ییەکان دەکات، جێگەی سەرسوڕمانە تەحلیلی ئەمەی نەکردووە دیار ئەم ماستە مویەکی تێدایە، ئەگەرنا ئەوەشی شارەزایی نەبێت لە زانستی فەرموودەدا، هەست بەوە دەکات، کە حەزرەت شتی وا ناڵێت لە بارەی خۆیەوە، پاشانیش، پێغەمبەرێك تەنها وەحی جیای بکاتەوە لە بەشەرەکانی دیکە، بۆچی دەبێت خواوەند دنیا لە بەر خاتری ئەو دروست بکات؟!، ئەی ئەو هەموو نێردراوە بۆچی نێردراون؟، ئەی عەدالەتو دادپەروەری خودا لە مەدا چۆنە؟، دنیا لەبەر خاتری کەسێك دروست بکرێت، پاشان ئەگەر دنیا لە بەرخاتری کە سێك دروست بکرێت بۆ دەبێت دنیاکە بمێنێتو کە سەکە بمرێت، بەڵام چی ئەکەی لە نووسەرێك بۆتە جێگەی تانەو تەشەر بۆ نووسەرانی دیکەشو لە جەهل و نەفامیی زیاتری بۆ کتێبخانەکان زیاد نەکردووە.

**ڕەخنەی بیستەم:** پ1، لا101، دێڕی (3) "ڕۆژی دوازدەیەمی (ربیع الاول) بەرامبەر بە ئۆکتۆبەری ساڵی (662)ی زاینی کە موحەممەد چوو بۆ مەدینە".

وامەزانی نووسەر تەنها لە نەقڵکردنی ڕووداودا کوڵەوارەو هەڵە نەقڵ دەکات، بەڵام پاش بینینی ئەم پەرەگرافە ئەوەشم زانی کە نووسەر لە مێژوو نەقڵکردنیشدا بەهەڵە چووە، حساباتی هەڵەی کردووە، لە پ1، لا3 دێڕی (1) دەڵێت (لە ساڵی 570ی زاینیدا منداڵێك..)

بەپێی ئەم مێژووەو پاشان لێدەرکردنی لە مێژووی کۆچیی حەزرەت دەردەکەوێت کە : 662–570= 92 ساڵ بوو کۆچی کرد بۆ مەدینە، کە هیچ مێژوونووسێك شتی وای نەوتووە!!.

تۆ بڵێی نووسەر وای زانیبێت کە کە س حساب دەزانێت!!.

**ڕەخنەی بیستو یەك:** پ2، لا127، دێڕی (1) "حوکمەکانی لەمەڕ تەڵاقو مارەبڕینو چلەو ...".

هەرچەند نووسەر لە خۆیەوە ڕەقەم لێدەدا، ئاوەهاش حوکم لێدەدات، ئەوەتا (چلە)ی لێبووە بە حوکمێکی ئیسلامیی، لەوە دەچێت نووسەر زۆر تێکەڵی پیرەژنی کردبێت، یان لە بەرئەوەی بە مەزهەب شیعەیەو بەوڵاتی ئێرانیە (چلە) لە وڵاتی ئەواندا لە مەزهەبی ئەواندا زۆر جێگەی باوەڕەو زۆر گرنگی پێدەدرێت، بۆیە ئەمیش لە لای بووە بە حوکمێکی ئیسلامیی، ئەگەر لە سەرچاوەکانی ئیسلام شارەزابوایە، دەیزانی لە ئیسلامدا شتێك نییە ناوی (چلە) بێت، تەحەددای نووسەریشو هەموو ئەوانەی کە وەك نووسەر بیردەکەنەوە دەکەم کە شتی وا لەهیچ دەقێکی قورئان، یان فەرموودەدا هاتبێت.

**ڕەخنەی بیستو دوو:** پ1، لا 138، دێڕی (5–10) "جاروباریش، یان بۆ خۆشخزمەتی، یان لە ڕووی قینی شەخسییەوە کەسێکیان دەکوشتو بەناوی ئیسلام پاساو دەکرا، هەروەك ئەوەی کە بۆ بازرگانێکی یەهودی هاتە پێش، کە لەگەڵ مسوڵماناندا هاتوچۆو پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو، بەڵام کوشتیان، ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) وتی: هەرپیاوێکی یەهودیتان دی بیکوژن، (محیصەی کوڕی مەسعود) هەستا بە کوشتنی کوڕی (سنیە)ی بێ تاوان".

هەرکەس ئەم پەرەگرافە بخوێنێتەوە سەری سووڕ دەمێنێت، ئاخۆ ئامانج لە کوشتن لە لای مسوڵمانان چی بێت، بە وتەی نووسەر ئامانج هەندێ جار خۆشخزمەتییە، واتە لەزەت وەرگرتنە، جاری واش هەیە قینی کەسێکی مسوڵمان لە کەسێکی کافر، واتە رقی شەخسیە، مێژووی ئیسلامیی زۆر دوورو درێژە، لەساڵی یەکی کۆچییەوە دەست پێدەکات، لە ساڵی 656کۆچی کۆتایی دێت بە هاتنی مەغۆڵو تەتارەکان، پاشان دەوڵەتی عوسمانی هەربەناوی ئیسلامەوە کاریان کردووە، هەرچەند هەڵەی زۆر گەورەیان هەبوو، تا لە ساڵی 1924ی زایینیدا بەڕووخاندنی ئەمانیش کۆتایی بەم دەوڵەتە هات، ئەم هەموو مێژووەو ئەم هەموو ناحەزو چاوبەستکەرەش کە مێژووی ئیسلامییان شێواندووە، نووسەر یەك حاڵەتی دەست نەکەوتووە بیکات بە بیانووی قسەکەی، تا هیچ نەبێت کەسێك بڵێت ئەوە بەڵگە، تۆ بڵێیت درۆ هەبێت لەمە شاخدارتر؟!.

پاشان دێتە سەر قینی شەخسیو ئەم نموونەیەی سەرەوە باس دەکات کە ئەو بازرگانی جولەکەیە هاتە پێش کە ئەویش (ابن سنیه) بوو.

سەرەتا بە قسەی نووسەر، ئەم بازرگانە زۆر هاتووچۆو پەیوەندیی پتەوی هەبوو لە گەڵ مسوڵماناندا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ جۆرە ڕقێکیان لێی نەبووە، ئەگەرنا چۆن پەیوەندیو هاتوچۆی پتەوی دەبێت"!.

پاشان پاش کوژرانی لە لایەن (محیصەی کوڕی مەسعود)، براکەی کە ناوی (حویصەی کوڕی مەسعود)ە زۆر تووڕەبوو کافریش بوو، دەستی کرد بە لێدانی (محیصە)و پێی وت: "هەموو چەوری ناو سکت لە ماڵی ئەوە"، محیصەش وتی: "بەخوا کە سێك فەرمانی پێکردم ئەگەر ئەمرم پێبکات بە کوشتنی تۆ ئەوا لە گەردنت دەدەم[1]، ئەمەش بەڵگەی دیکەیە کە محیصە هیچ ڕقێکی شەخسی لە (ابن سەنیە) نەبوو، بەڵکو ئەمری حەزرەت بوو[2].

بۆیە پێویستە بزانین بۆ ئەم ئەمرەی دەرکرد؟

پاش ئەوەی قوڕەیش هەرچی هەبوو کۆی کردەوە بۆ شەڕی موحەممەد (ﷺ)و یارانیو هاتن چواردەوری مەدینەیان داو ترسو بیمێکی زۆریان لە دڵی مسوڵمانان زیادکردو ئا لەم کاتە ناسکەدا، جولەکەی (بنی قریظة) لە ژێرەوە ئەو پەیمانەی هەیانبوو لەگەڵ مسوڵمانان شکاندیانو پەیمانیان بەست لەگەڵ کافرەکان، بەم شێوەیە لە دەرەوەو ناوەوە مسوڵمانان دوچاری گەورەترین دوژمن بوونەوە، ئەوەبوو کافرەکان وازیان هێناو گەڕانەوە، پاشان بەهۆی ئەو پیلانانەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕێگەی وەحییەوە ئەمری پێکرا کە شەڕ لەگەڵ جولەکەی (بنی قریظة) بکات، ئەویش ئەمری دەرکرد، کە هەرپیاوێکی یەهودیتان بینی کە دیاریکرابوو لە (بنی قریظة) بیکوژن، بۆیە محیصەش (ابن سبیەی) کوشتو پاشان براکەی (محیصە) بێتاوان نەبوو، وەك عەشرەت هەر هەموویان پاڵپشتی کافرانیان کرد، لە دژی مسوڵمانان.

***ڕەخنەی بیستو سێ:*** پ1، لا194، دێڕی (6) "ئەگەر ئازایەتیو خۆڕاگری عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەبوایە، ئەوا پێغەمبەریش شەهید دەبوو".

لێرەدا دەمارگیری شیعەیەتی نووسەر جوڵاوەو هەرچەند باوەڕی بە ئایینی عەلمانیەتە، بەڵام مانەوەی پێغەمبەرو ئەو ئایینەش بە فەزڵی ئەو دەزانێ، لە کاتێکدا ئەم ڕووداوەی نووسەر باسی لێوە دەکات، جەنگی ئوحودە، بابزانین عەلی کوڕی ئەبو تالیب خۆی بەتەنها بوو یان کە سی تری لە گەڵ بوو:

پاش ئەوەی ددانێکی پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاسەوە شکێنراو لێوی خوارەوەی بریندار بوو، عەبدوڵڵای کوڕی شەهاب بریندار ی کرد بەوەی لە نێو چاوانی حەزرەتیداو ئیبن قمئە کوڵمی پێغەمبەری (ﷺ) بریندار کردو دوو حەلقە لە درعەکەی دەمو چاوی چەقی بە کوڵمیداو پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە چاڵێکەوە کە ئەبو عامر هەڵی کە ندبوو بۆ ئەوەی مسوڵمانانی تێبکەوێت، لەم کاتەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی پێغەمبەری گرتو تەڵحەی کوڕی عەبدوڵڵا بەرزی کردەوە هەتا هەستاو مالیکی کوڕی سینان خوێنەکەی دەموچاوی مژیو ئەبو عوبەیدەی جەڕاح هەردوو

---

[1] السيرة النبوية. لابن هشان، ج3، ص58.

[2] خۆ ئەگەر حیقدی مسوڵمانان ببوایە لە کە سێك، دەبوایە حبیرەی کوڕی أبی وەهبی مەخزومی، کە ئەو هەموو شیعرەی هەیە لە وەسفی شەڕی ئوحودو ئەو هەموو گریانەی هەیە بۆ کوژراوانی شەڕی بەدر دژ بە مسوڵمانانو جیابوونەوەی هاوسەرە مسوڵمانەکەی لێیو بەشداری لە شەڕی خەندەقدا، بەڵام دوایی لە مەککەدا بە کافری مایەوەو مەکەش ئازادکراو کە س دەستێکی بۆ نەبرد، تا خۆی بۆ خۆی بە کافری مرد.

حەڵقەکەی کوڵمی پێغەمبەری دەرهێناو بە ددانیو هەردوو ددانی لە دەست دا[1] ، ئەمانە هەموو پارێزگاریان کرد لە حەزرەت بەیەکەوە هاوکاریان کرد، بەڵام نووسەر ئەو بەشەی کە خۆی حەزی لێدەکات نەقڵی دەکات، بۆیە دەبێت بزانین تا چەند ئەم نووسەرە بە ئەمانەتەوە شتی نەقڵ کردووە.

**<u>ڕەخنەی بیستو چوار:</u>** پ2، لا199، دیڕی (4–6) لە ئایەتی 23 داو لە ئایەتی 24 دەبێت (لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِن شَاء أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ...) واتە خودا پاداشتی چاکە بەخۆڕاگرتن (لەشەڕی خەندەك)دا دەداتو ئەگەر خواستی دووڕوان بەسزا دەگەیەنێت، یان دەیانبەخشێت. هەمان شێوە پ3، لا200، دێڕی (1..4) (لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِن شَاء أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً) واتە خواوەند پاداشتی چاکەی ڕاستبێژان دەداتەوەو ئەگەر ویستی دووڕووان سزاو ئەشکەنجە دەدات، یان تەوبەیان قبوڵ دەکات، خودا بەخشندەو میهرەبانە (ئایەتی 44ی سورەتی ئەحزاب).

ئەوەی ئەم دوو لاپەڕەیە بخوێنێتەوە واتێدەگات ئەم ئایاتە دوو ئایەتی وەکیەکن یەکێکان لە ئایەتی 23و 24 ئەوی تریان لە ئایەتی 44 هەمان سورەتو نووسەریش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سەبارەت بە شەڕی خەندەك هاتووەتە خوارەوە، بەڵام نووسەر، چونکە خەڵکێکی ئەکادیمی نییەو نەهاتووە سەیری تەفسیرەکان بکاتو بە حەزو ئارەزووی خۆی تەفسیری کردووە لێرەدا خراپ تێکەوتووە، یەکەم ئەم ئایەتە (23، 24) نییەو تەنها ئایەتێکەو لە لاپەڕە (200) دەڵێت "ئایەتی (44) ئەسڵی نییەو هەردوو ئایەتەکە هەریەك ئایەتن".

ڕاستە ئایەتی (22)ی هەمان سورەت باسی غەزوەی ئەحزابو خەندەك دەکات، بەڵام ئایەتی (23) بە هیچ شێوەیەك باسی خەندەك ناکاتو لەبارەی (ئەنەسی کوڕی نەزیر) هاتووەتە خوارەوە کە لە غەزوەی ئوحوددا شەهیدبووە، باسەکەشی باسی خۆڕاگریو پاداشتی ئەو کەسەیە، کە هاوەڵانی حەزرەت تێکشکاندو بەجێیان هێشت ئەو بەجێینەهێشت کە شەهید بوو لە شی هەشتاو ئەوەندە برینی پێوە بوو، ڕاڤەی ئایەتەکەش ئەوەیە کە خودای گەورە پاداشتی ڕاستگۆیان دەداتەوە بە ئارامگرتن لە سەر ئەو بەڵێنانەی کە بەخوایان داوەو سزای دووڕووان دەدات، ئەوانەی کە بەڵێنەکانیان شکاندو پێچەوانەی فەرمانی خوا کاریان کردووە بۆیە شایستەی سزای خوای گەورەن، هەر هەمووانیش لە ژێر ویستو ئیرادەی ئەودان، لە دنیادا ئەگەر ویستی وا دەیانهێڵێتەوە هەتا دەگەنە بەرقاپی خواوەندو سزایان دەدات، یان ڕێنموویيان دەکات تا وازدەهێنن لە دووڕوویيو ئەویش تۆبەیان لێ قەبوڵ دەکاتو هیدایەتیان دەدات بەو شێوەی کە باسمان کرد. چونکە خوای گەورە لە گوناه خۆشدەبێتو سۆزو ڕەحمەتیشی هەیە لەسەر بەندەکانی[2] ، خوێنەر پاش خوێندنەوەی ئەم ڕەخنەیە تێدەگات نووسەر تاچەند توانیویەتی سەرکەوتوو بێت لە بابەتەکەیداو حوکم بەجێ دەهێڵم بۆ ئەو.

---

[1] السيرة النبوية، لابن هشام، ج3، ص80.

[2] تفسير إبن كثير، ج3، ص684، مؤسسة المختار، طبع 2006.

# بەشی سێیەم

سەرجەم گەلانی دنیا خاوەنی کلتورو هونەرو ڕۆشنبیری خۆیانن، جا ئەو کلتورو هونەرە سادە بێت، یان لە ئاستێکی پێشکەوتوودابێت، نووسراو بێت‌و لە خانەی کتێبخانەکاندا، یان لە شێوەی چیرۆك‌و دەماودەم بگێڕدرێتەوە، ئەمانە هەمووی پێیان دەوترێت سامانی نەتەوەیی، یان وەك ئەو سەیریان دەکرێت کە دەبێت گەلان هەوڵی پاراستن‌و زیادکردنی بدەن، ئەویش لە ڕێگەی توێژینەوەو تێفکرینی نوێوە یان لە ڕێگەی وەرگێڕانی هونەرو ڕۆشنبیری‌و بەرهەمی گەلانی دیکەی سەر ڕووی زەوی، وەرگێڕانی ئەم پەرتوکەی لە ژێر تیشکی ڕەخنەی ئێمەدایە، یەکێکە لەو بەرهەمانەی کە وەرگێڕ ویستوویەتی بەرهەمێك بۆ کتێبخانەی کوردی زیاد بکات، ئەمە وەك بەهانەی ئاشکرا، ئەگەرنا لەپشت وەرگێڕانەکەیەوە شتی‌تر هەیە، بەڵام سەد مەخابن، بەرهەمێکی سەقەت‌و نەزۆك کە بەبڕوای من ئەگەر ڕۆشنبیری کوردی تووشی دوودڵی نەکردبێت لەو مێژووەی کە ڕاستەوخۆ بیستوویەتی هیچی [illegible]اد نەکردووە، هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وەرگێڕ لەکاتی هەڵبژاردنی بابەتەکە سەرکەوتوو نەبووە، نەك لە بە [illegible]بابەتێکی وەرگێڕدراوە لە دژی ئاین، بەڵکو لە بەرئەوەی بابەتەکە لە ئەساسەوە لاوازەو خودی نووسەری کتێبەکە بەسەدان هەڵەی ئاشکراو بێ مانای کردووە، خاڵێکی دیکە ئەوەیە دەکرێت وەرگێڕ شارەزایی هەبووبێت لە زمانی نووسەر بەڵام ڕێگە نادات بەوەی ئەم وەرگێڕانە ببێتە کارێکی ئەکادیمی، لەوانە وەرگێڕ زمانی نووسەری تەنها وەك تێگەیشتن‌و قسەکردن زانیوە نەك ئەساس‌و بەلاغەو ڕەوانبێژی زمانی نووسەر، لە لایەکی دیکە، بەرهەمە ئەساسییەکە هەندێجار تێکەڵە لە زمانی دیکە، وەرگێڕیش لە و ئاستەدا نییە کە بتوانێت وەرگێڕانی دوو زمان لە یەککاتدا بکات‌و کێشەو هەڵەی زەقی تێدا نەکات، بۆیە زۆرکات دەقەکان دەخوێنێتەوە لێیان تێناگەیت، یان تێیان دەگەیت وەك وشە، بەڵام نازانیت مەبەستی ڕوونی چییە، خۆ کاتێك دەگەیتە وەرگێڕانی دەقە عەرەبییەکان بەڕاشکاوی بۆت دەردەکەوێت کە وەرگێڕ، نەك هەر عەرەبی نازانێت، بەڵکو کەمیش بەلایدا دەچێت‌و ئاگای لە بنچینەی ئەو زمانە نییە بەشێوەیەکی دروست، هەربۆیە دەڵێم: وەرگێڕان کارێکی زۆر گرانە ئەگەر وەرگێڕ ئالیەتی گونجاوی پێنەبێت‌و پەیوەندی تەواو نەکات لەو شێوازانەی کە دانراوە بۆ وەرگێڕانە، کە بۆ نموونە وەرگێڕانی هەردەقێك دەکرێت یان وشە بە وشە بێت یان مانای لێ وەربگیرێت، دەقێك کە لەم نووسراوەی بەردەستماندایە هەندێ جار پەیڕەوی وشە بە وشە کراوەو هەندێ جار مەفهوم جاری واش هەیە هیچکامیان، یان هەردووکیان، کە وای کردووە، وەرگێڕانەکە زۆر سەقەت بێت، بۆیە دەتوانم بڵێم ئەوەی بەسەردا دەسەپێت کە حەقی خۆی نەداوەتە بابەتەکەو هەر کەسێکیش حەقی خۆی نەداتە خاوەنی حەق، ئەوا ستەمکار دەبێت، یان دەکرێت بڵێم مافی کەسێکی دیکەی پێشێل کردووەو بە کوردی‌و بەکورتی خیانەتی ئەدەبی کردووە، بەبڕوای من خیانەتی ئەدەبیش زۆر گەورەترە لە خیانەتی دیکە، چونکە چینێکی هەستیاری کۆمەڵگە بە هەڵدێردا دەبەیت‌و بەرەو خیانەت ملی ڕێدەگری‌و سەرنجامەکەی بە خائینی گەل‌و وڵات کۆتایی پێدێت، کاری خیانەتیش ئەستەمییەکەی لە وەدایە بە بەسەرچوونی کات بواری ئەوەی نامێنێت‌و پەشیمانی دەربڕێت هەربۆیە دەبێتە ڕسوابوون‌و شەرمەزاری بەردەم گەل‌و نیشتمان، بەم پێشەکیەش ڕەخنەکانم ئاراستەی وەرگێڕ دەکەم کە هیوادارم ستەمکارو بێویژدان نەبووبم بەرامبەری:

<u>**ڕەخنەی یەکەم:**</u> پ2، لا1، دێری (1-3) "ئێمە هەرچەندە سەرنجمان لە سەر هەندێك تێڕوانینی نووسەر هەیە، کە لە هەندێك شوێنی نووسینەکەیدا بۆن‌و بەرامەی شۆڤێنیەتی یان ئێرانیزمی پێوە دیارە".

هەرچەندە وەرگێڕ ئەم پەرەگرافەی نووسیوە، بەڵام لە سەرەتای کتێبەکە تا دوایی لە هیچ شوێنێکدا ئاماژە ناکات کە نووسەر لێرەدا شۆڤێنیانە ڕای دەربڕیوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەیتوانیوە ئەو شوێنانە دیاری بکات.

ئەم قسەیەی خۆشی پشتڕاست نەکردووەتەوە.

**ڕەخنەی دووەم:** پ2، لا47، دێڕی (1–3) "خودا بەلای ئەمانەوە کائینێکی بڕیاردەرو حەقیقەتی کارێك، ڕازی نین لەم ڕووەوە لەململانێکردنی عەشیرەتێکدا کە بتێکی ناوداریان هەیە".

ئەمە دەقی پەرەگرافێکە کە لەبەر کلۆلی وەرگێڕ لە ڕووی زمانەوانیو هونەری وەرگێڕان، ئەم دەقەی وا لێکردووە، نە مانا دەدات بەدەستەوە، نەبێ مانایە، وەك پەرەگراف مانای نییە، بەڵام وەك تاکە تاکەی وشەکان ماناداڕن، کە زۆرم هەوڵدا لێی تێبگەم، بەڵام نەمتوانی، بۆیە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکە، بەڵکو لێی تێبگات.

**ڕەخنەی سێیەم:** پ3، لا(119)، دێڕی (1–2) "لە مەدینەدا سێ عەشیرەت بەناوی (بنی قینقاع)و (بنی نضیر)و (بنی قریظة)".

وەڵامی ئەم ڕەخنەیە بەم سەرگوزشتەیە دەدەمەوە، ئەڵێن ڕۆژێکیان پیاوێك پرسیار دەکات لە مامۆستایەك: ئەوە کچی چ ئەولیایەك بوو کەوتە ناو کارێزەوە؟، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: کچ نەبوو کوڕ بوو، ئەولیا نەبوو ئەنبیا بوو، کارێز نەبوو بیر بوو، هەربۆیە دەڵێم: بەنی نەصر نییە، کاکی وەرگێڕ (نضیر)ە!.

**ڕەخنەی چوارەم:** پ2، لا170، دێڕی (1–4) "لەم ڕووەوە هێشتا قسە ماوە کە بکرێت، چونکە فەرموودەیەکی عائیشە هەیە کە هەموو فەرموودەناسەکان ڕاستیی ئەم فەرموودەیەیان پەسەند کردووە، ئەویش ئەوەیە کە حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) مەگەر نەمرد، خۆ تەواوی ژنان لەو حەڵاڵ بوون؟"

سەرەتای پەرەگرافەکە باسی فەرموودەیەکی پەسەند دەکات، بەڵام نەفەرموودە دیارە، نە واتاکەی، ئەوەیە بابەتی زانستیو ئەکادیمی!، جا نازانم بۆچی باسی دەکات کە ناڵێ کامەیەو چییە، تەنها ئەوەندە نەبێت لە کۆتایی پەرەگرافەکەدا باسی دەکات کە من زۆر هەوڵمدا لێی تێنەگەیشتم، خوازیارم وەرگێڕ وەڵام بداتەوە.

پاشان کە فەرموودە باس دەکرێت، لە هیچ شوێنێك جێگەی قەبوڵ نییە تا سەنەدو مەتنو گێڕەرەوەی فەرموودە باس نەکرێت، نووسەرو وەرگێڕ لە بەرئەوەی شارەزاییان نییە لە فەرموودەدا باسی هیچیان لەمانە نەکردووە.

**ڕەخنەی پێنجەم:** پ3، لا 188 "لە قورئاندا خودا خاوەن هەموو جۆرە تایبەتمەندیو خاسیەتێکی تەواوە، دانایە، بە توانایە، بێنیازە، خاوەن بیستەرەو موریدە، واتە سەرجەم جیهانی بوون لە ژێر ئیرادەو ویستی ئەودایە، بەڵام خاسیەتو تایبەتمەندیتری وەك زۆردار، قەهار، تۆڵەسێنو کین لە دڵیشی بۆ دانراوە، تەنانەت لە داگیرکردنی ژنی ئەمو ئەویش چاویان نەدەپۆشی (گەڕانەوە بۆ داستانی ئورمیاو داود)".

پ3، لا 188 "لە قورئاندا خوادا خاوەنی هەموو جۆرە تایبەتمەندیو خاسیەتێکی تەواوە، واتە دانایە بە توانایە، بێنیازە، هێمنەو بیستەرەو حەکیمو موریدە، واتە سەرجەم جیهانی (بوون) لە ژێر ئیرادەو ویستی ئەودایە، بەڵام خاسیەتو تایبەتمەندی تری وەك زۆرداریی، قەهار، تۆڵەسێن، کین لە دڵیشی بۆ دانراوە، تەنانەت لە فێڵو مەکرو تورەییدا خاوەن بەهرەیەکی گەورەیەو هەندێکجاریش (خیر الماکرین)".

ئەوەی ئەم دوو پەرەگرافە بخوێنێتەوە تێدەگات کە نووسەرو وەرگێڕ تا چ ئەندازەیەك بەپەرۆشن بۆ بەهای زانستی نووسینەکەیان، خۆ ئەگەر نووسەر بەهەڵەدا چووە، وەرگێڕ بۆ پێی ناشیرینە هەڵەی ئەو نەکات، دەنا ئەگەر یەك ئەندازەی کەم سەلیقەی وەرگێڕانی هەبایە ڕێگەی نەدەدا بۆ دووبارەبوونەوەی دوو پەرەگرافی وەك یەكو سەرەتاو کۆتایی پەرەگرافی یەکەم دوو واتای دژ بەیەکیان هەیە.

سەرەتاکەی باسی خوا دەکات، کۆتاییەکەی باسی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوە نووسەرو وەرگێڕن خوداو پێغەمبەریان لێبووە بەیەك، ئەوە نووسەرە هەرشتێك وترا بێت بەناوی ئیسلامەوە وەریگرتووە، ئەگەرنا کێشەی داودو ئورمیا، لە قورئاندا باسی ئورمیا هەر ناکاتو باسی (گوێرەکە)یە، نووسەرو جولەکە هاوبیرەکانی بە خێزانەکان لێکیان داوەتەوە، ئەوەشی کە باسی سیفەتو ناوەکانی خوا دەکات، نووسەرو وەرگێڕ لێیناگەنو سەیری خودا وەك پیرێکی ڕیش سپیو هەندێجار گەنجێکی سەرکەش، ئەگەر بیانویستایە سەرچاوەی زۆر هەیە کە بەسادەیی باسی سیفاتەکانی خودا دەکات و

له سیفەتەکانی مرۆڤ جیا دەکرێتەوە، بەوەی ئەوەی هی خوا بێت تەنها لە ناودا لە هی بەشەر دەچێت، لە ناوەڕۆکدا وانییە.

**ڕەخنەی شەشەم:** پ1، لا204، دێڕی (1-3) "لە قورئاندا مەسەلەی پاشگەزبوونەوەو پەشیمان بوونەوە یەکجار زۆرە، زانایانی ئاینیی و لێکۆڵەرەوان و مەلاکان هەموو ئەم حاڵەتەیان لە لای خۆیان دیاریکردووەو تۆماریان کردووە".

پ2، لا204، دێڕی (1-2) "(مەنسوخ) بریتییە لە ئایەتێك کە لە پێشدا هاتۆتە خوارو دواتر ئایەتێکی تر هاتووە کە (ناسخ)، یان ڕەتکەرەوەی ئەو ئایەتەی پێشتر".

ئەم دوو پەرەگرافە تەواوکەری یەکترن، بەڵام لەبەرئەوەی وەرگێڕ یەکجار کلۆڵە لە وەرگێڕاندا باسی نەسخی بە پاشگەزبوونەوە کردووە، لە کاتێکدا پاشگەزبوونەوە بە واتای (ردە) دێت. پاشان سەبارەت بە زۆری نەسخ لە قورئاندا، ئەگەر یەکێك شارەزایی نەبێت لە قورئاندا وا دەزانێت ئەم قسەیەی نووسەرو وەرگێڕ، دەکاتە ڕێژەی نیوەی قورئان، یان چارەکی، بەهەرحاڵ یەکجار زۆر دەکاتە زۆرینە، بەڵام با خاتری نووسەرو وەرگێڕ بگرین، خۆ ئەگەر بێینە سەر حەقیقەت ئەم ڕێژەیە دەگۆڕێت، چونکە لە هەموو قورئاندا تەنها (22) ئایەت نەسخ بووەتەوە، حوکمی تازە هاتووە، بەڵام لەو ژمارەیە تەنها (8) ئایەت سابتە کە نەسخ بووەتەوە، ئەگینا (14) ئایەتیان جیاواز (خیلاف)ی لە سەرەوە لە و ژمارەیەش دەتوانین بڵێین نەسخ نەبوونی زۆرینەیان جێگرە[1]، بەهەرحاڵ ئەمە زانیاری نووسەرو وەرگێڕە لە ئیسلام تەنها ناوەکەی دەزانن و لە قورئان تەنها ڕەسمەکەی، ئەوەشی کە دەڵێت "زانایانی ئاینیی و لێکۆڵەرەوان و مەلاکان" باسی کە سیان ناکات ئاماژەش بۆیەك ئایەت ناکات، سەبارەت بە نەسخ بۆ زانیاری نووسەرو وەرگێڕ سێ جۆر هەیە، بەلای نووسەرو وەرگێڕەوە نەسخ، چۆن دەبێت ببێت، شتێکی ئەوەندە قورس نییە، بۆ نموونە: خوای گەورە سەرەتا شەونوێژی لەسەر پێغەمبەرو هاوەڵان فەرزکردبوو، پاشان لەسەر هاوەڵان بوو بە سوننەت و لەسەر حەزرەت بە فەرزی مایەوە، کەواتە مەسەلەکە تەنها بۆ پەروەردەکردنی جیلی یەکەم کە دەبێت نوخبەی هەموو کۆمەڵێك پەروەردەیەکی زۆر قورس بکرێن، بۆ تەحەمول کردنی گەورەترین ناهەمواری کە هەمیشە لەهەموو گروپ و کۆمەڵ و پارتێکدا وابووە، جیلی یەکەم لەهەموان زیاتر پابەندبوون بە بەرنامەکەیانەوە، ئەمەش ئایەتە نەسخەکانە.

**ناسخەکان:**

1. سورەتی البقره (115).
2. سورەتی البقره (180).
3. سورەتی البقره (183).
4. سورەتی البقره (184).
5. سورەتی البقره (217).
6. سورەتی البقره (240).
7. سورەتی البقره (284).
8. سورەتی آل عمران (102).
9. سورەتی النساء (8).
10. سورەتی النساء (33).
11. سورەتی النساء (15-16).
12. سورەتی المائده (2).
13. سورەتی المائده (42).
14. سورەتی المائده (106).
15. سورەتی الانفال (56).
16. سورەتی التوبه (41).
17. سورەتی النور (3).
18. سورەتی النور (58).
19. سورەتی الاحزاب (52).
20. سورەتی المجادلة (12).
21. سورەتی الممتحنة (11).
22. سورەتی المزمل (1-4).

[1] مناهل العرفان في علوم القرآن، السيوطي، ص1-12.

**مەنسوخەکان:**

1. سورەتی البقرە (144).
2. سورەتی النساء (11)، ئایاتی میرات بە ئیجماعی ئوممەت.
3. سورەتی البقرە (187).
4. سورەتی البقرە (185).
5. سورەتی التوبە (5-36).
6. سورەتی البقرە (234).
7. سورەتی البقرە (286).
8. سورەتی التغابن (16).
9. سورەتی النساء (11-12).
10. سورەتی الانفال (75).
11. سورەتی النور (2).
12. سورەتی التوبة (36).
13. سورەتی المائدة (49).
14. سورەتی الطلاق (2).
15. سورەتی الانفال (66).
16. سورەتی التوبة (91-122).
17. سورەتی النور (32).
18. ناسخەکەی دیار نییە کەواتە نەسخ نەکراوە.
19. سورەتی الاحزاب (50).
20. سورەتی المجادلة (13).
21. سورەتی الانفال (41).
22. سورەتی المزمل (20).

کەواتە دەکرێت بڵێین نەسخ بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، گرنگترین قۆناغیان بۆ پێگەیشتن و تێگەیشتنی کۆمەڵگەبووە، سەرجەم ئەو فەرموودانەی ئایەتی ناسخو مەنسوخیان تێدایە هەمووی لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە تەنها سەرەتای (المزمل) نەبێت، یان بەشێوەیەکی دیکە سەرجەم بابەتەکان ئەحکامی پەرستشە نە بیروباوەڕ، نەسخ سێ شێوەی لە خۆگرتووە:

**یەکەم:** نەسخی لە فزی (دەقی ئایەتەکە): لەفز، واتە دەقی ئایەتەکە لە قورئاندا نەماوە، بەڵام حوکم پێکردنی ماوە، وەك مەسئەلەی ڕەجمکردنی ئافرەتێکی زیناکەر کە مێردی هەبێت، یان پیاوێك کە ژنی هەبێت، کە ئەسڵی ئایەتەکە (الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما ألبتة)[1] دەقەکە نەسخ بووەتەوە، بەڵام حوکم پێکردنی ماوە، هەروەك لە سیرەدا جێگیر بووە.

**دووەم:** نەسخی حوکمیی (یاساکە)، واتە دەقی ئایەتەکە لە قورئاندا ماوە، بەڵام حوکمی پێناکرێت، وەك ئایەتی (115) سورەتی البقرە، کە نەسخ بووەتەوەو دەقەکەی لە قورئاندا ماوە، بەڵام حوکم بەو فەرمانە ناکرێت، کە واتای ئایەتەکە بە ئایەتی (144)ی هەمان سورەت جێگەی گیراوەتەوە.

**سێیەم:** نەسخی لەفزو حوکم (ئایەتەکەو یاساکەش)، واتە لە هەمانکاتدا دەقی ئایەتەکە نەماوە، بەهەمان شێوە حوکمیشی پێناکرێت.

[1] تفسیر القرآن العظیم، ابن کثیر، ص382، ط2006، ج3، مؤسسة المختار القاهرة.

# بەشی چوارەم

نووسین لەسەر هەر بابەتێکی زانستیی، یان مێژوویی، یان ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی کارێکی ئەوەندە گران نییە، چونکە نەقڵکردنی دەقەکان وردبینییەکی ئەوتۆی ناوێ، بەڵام ڕەخنەگرتن لە ئاین لە بەرئەوەی لە سەر دوو بنەمای ئەساسی بەندن، کە ئەوانیش قورئان و فەرموودەیە کارێکی زۆر دژوارەو وردبینییەکی یەکجار زۆری دەوێت، بە تایبەتتر، قورئان، چونکە زۆرجار وشەیەك بە گۆڕانی نیشانەیەکی ئیعرابی، یان پێکهاتەی وشەکە لە ڕووی (سەرفە)ەوە ماناکەی دەگۆڕێت و هەندێ جار حوکمەکەشی دەگۆڕێت، واتا ئەسڵەکەی، یان حوکمە سەرەتاییەکەی، بۆ نموونە:

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ) ئایەتی (28) سورەتی (فاطر) وشەی (الله) ئەگەر بەمەرفوعی بخوێندرێتەوە واتە دانانی (بۆر) لەسەری واتاکەی دەبێتە کوفر، ئەمەش لەوەوە دروست دەبێت زۆرجار ئەوانەی شارەزایی ئەوتۆیان نییە ئەو وشەیەی دوای کردار (فعل) بێت بە مەرفوع دایدەنێن، بە حسابی ئەوان فاعلە، بۆیە لێرەدا پاش و پێش کەوتووەو وشەی (الله) مەفعولەو (العلماء) فاعیلەکەیەتی، یان لە ڕووی سەرفەوە، وشەی (لمس) واتە دەستی لێدا، بەزیادکردنی (ألف) دەبێت بە (لامس) واتاکەی دەگۆڕێت بۆ سەرجێگەیی نێوانی ئافرەت و پیاو، یان وشەی (مطهرين) واتە ئەوانەی خۆیان پاکن، بەڵام (متطهرين) بەزیادکردنی (ت) دەبێتە ئەوانەی کە خۆیان پاکدەکەنەوە، هەربۆیە خیلاف و جیاوازییەك هەیە لەلای زانایان لەبارەی ئایەتی دەست لە قورئاندان کە (لايمسه الا المطهرين)، کەواتە نەقڵکردنی ئایەت و بەڵگەهێنانەوە پێی وردبینییەکی زۆری دەوێت، سەبارەت بە فەرموودەش دەبێت ئەوە بەرچاو بگیرێت کە فەرموودە لە ڕووی نەقڵکردنی دەقەوە وەك قورئان نییە، چونکە دەتوانرێت بەمانا نەقڵ بکرێت، بەڵام دەبێت ئاماژە بکرێت بۆ ئەوەی کە مانایە، نەك دەق، لە هەمانکاتدا فەرموودە دەبێت حاڵەتی تایبەتی لە ڕووی زانستی فەرموودەوە، کە ئایا فەرموودەیەکی دروستە، یان باشە، یان زەعیفە، یان هەڵبەستراوە، لە کاتێکدا لە ڕووی قەبوڵەوە تەنها فەرموودەی دروست و باشە (صحيح، حسن) وەردەگیرێن، کێشەی ئەو خەڵکانەی کە لەسەر ئیسلام دەنووسن و ئاگایان لەم بابەتە زانستییە نییە زۆر زوو تێدەکەون، بابەتەکانیان بەهای زانستیی نابێت، هەربۆیە ئەم چەند ئایەتەی کە نووسەر بەبەڵگە هێناونیەوەو وەرگێڕیش نەقڵی کردون، تاوانی هەڵەکانیان لە گەردنی هەردووکیانە، بەڵام زیاتر لە ئەستۆی وەرگێڕە، چونکە دەبوایە لەسەر شتێکی وا بنووسێت زانیاری تەواوی هەبێت لەسەری، لە کاتێکدا لە لا (VIII) لە پێشەکییەکەیدا لە دێڕی (40)دا دەڵێت "ئەمە جگە لەوەی هەندێ پەرەگراف هەڵەی چاپی تێدا ڕاستکراوەتەوە":

***__یەکەم:__*** پ4، لا9، دێڕی (1–2) (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْياً..) ئایەتی (51)، سورەتی (شورى).

سەرەتا ئایەتەکە بە تەواوی باسی تری لەگەڵە (أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ)، پاشان ئەگەر یەکێك لە نووسەر بپرسێت ئایەتی (وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيماً) مانای چی دەگەیەنێت، لە کاتێکدا تۆ مانای ئایەتی یەکەم بەمشێوەیە دەکەیت: واتە ئەم بوارو دەرفەتە بەهیچ کەسێك نەدراوە کە خودا قسەی لەگەڵ بکات، تەنها لە ڕێگەی وەحییەوە نەبێت.

ئەم بێئاگاییەی نووسەرو وەرگێڕ لە بەهای زانستیی نووسراوەکەیان کەم دەکاتەوە.

***__دووەم:__*** پ3، لا24، دێڕی (6) "ومن يظل الله فما له من هاد" زمر (23)

ڕاستییەکەی (وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ).

***__سێیەم:__*** پ3، لا86، دێڕی (1) (وما أرسلناك قبلك الا رجالا نوحي اليهم...) ألانبياء (7–8).

ڕاستییەکەی (وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِمْ).

***__چوارەم:__*** پ4، لا86، دێڕی (1) (وما أرسلنا من قبلك الى رجالا نوحي اليهم).

ڕاستییەکەی (وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِمْ).

**پێنجەم:** پ1، لا87 دێڕی (4) (وما جعلنا لبشر من قبلك الخلد أفأين مت فهم خالدون) الانبياء (34).

ڕاستییەکەی (وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ).

**شەشەم:** پ1، لا(87)، دێڕی (6) (ماكنت تدري من ما الكتاب ولا الأيمان) شورى (52).

ڕاستییەکەی (..مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ...).

**حەوتەم:** پ2، لا 95، دێڕی (1) (ولاتكونن من الذين بأيات الله فتكون من الخاسرين) يونس (95).

ڕاستییەکەی (وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِ اللّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ).

**هەشتەم:** پ1، لا96، دێڕی (6) (فاصعد بما تؤمر وأعرض عن المشركين..) حجر (94، 95)

ڕاستییەکەی (فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ).

**نۆیەم:** پ9، لا113، دێڕی (1) (يا أيها الذين آمنوا الذين يلونكم من الكفار وليجدوا فيكم غلظة) توبة (123).

ڕاستییەکەی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً).

**دەیەم:** پ2، لا115، دێڕی (1) "ولاتجادلوا أهل الكتاب الا بالتي هي أحسن الا الذين ظلموا منهم وقولوا عامنا بالذي أنزل الينا..."العنكبوت.

ڕاستییەکەی (وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا...).

**یازدەیەم:** پ6، لا120، دێڕی (1) "ألم تر ألى الذين نصيبا من الكتاب يؤمنون با الجبت والطاغوت..."

ڕاستییەکەی (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ...).

**دوازدەیەم:** پ3، لا122، دێڕی (1) "ولولا أن نكتب الله عليهم الجلاء لعذبهم في الدنيا ولهم في الآخرة عذاب النار..) حشر (3,4)

ڕاستییەکەی: (وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاء لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا...).

**سیازدەیەم:** پ2، لا132 دێڕی (1) (فاذا القيتم الذين كفروا فضرب الرقاب، حتى إذا اثختنتموهم فشدوا الوثاق) آل عمران (85).

ڕاستییەکەی: (فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ..) سورەتی (محمد) ئایەتی (4).

**چواردەیەم:** پ4، لا137، دێڕی (1) (فما لكم من المنافقين فئتين والله اركسهم بما كسبوا أن تريدون أن تهدوا من أضل الله) نساء(88)

ڕاستییەکەی (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُواْ..)

**پازدەیەم:** پ2، لا146، دێڕی (1) (وإن طائفتان من المؤمنين اقتلوا فأصلحوا بينهما فان بغت إحداهما على الاخرى فقاتلوا التي تبغي حتى تقى الى الامر الله فإن فائت فأصلحوا بينهما بالعدل).

ڕاستییەکەی: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ..) الحجرات (9).

**شازدەیەم:** پ5، لا151، دێڕی (1) (ياايها الذين آمنوا لايسخر قوم عسى ان يكون خيرا منهم ولا نساء من نساء عسى أن يكن خيرا منهن وتلمزوا انفسكم ولاتنابزو بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الايمان) الحجرات (11).

ڕاستییەکەی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْراً مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْراً مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ...).

**حەڤدەیەم:** پ3، لا152، دێڕی (1) (يا أيها الذين آمنوا لايحل لكم أن تارثوا النساء كرها ولاتعضلوهن لتذهبوا ببعض ما اتيتموهن الا يأتين بفاحشة مبينة وعاشروهن بالمعروف) نساء (19).

ڕاستییەکەی: (يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ..).

**هەژدەیەم:** پ4، لا159، دێڕی (3) (یاأیها النبي اذا جاءك المؤمنات یبایعنك علی أن لاشرکن بالله شیئا ولا یسرقن ولا یزنین ولایقتلن اولادهن ولایأتین ببهتان...) ممتحنة (12).

ڕاستییەکەی: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئاً وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ..).

**نۆزدەیەم:** پ3، لا196، دێڕی (1) (إهدنا الصراط المستقیم صراط الذین انعمت علیهم، غیر مغضوب علیهم ولا ضالین) فاتحة (5-6-7).

ڕاستییەکەی: (اهدِنَــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ).

**بیستەم:** پ2، لا219، دێڕی (1) (أولم یر الذین أن السموات والارض کانتا رتقا ففتقناهما..) الانبیاء (30).

ڕاستییەکەی: (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ..).

# بەشی پێنجەم

**یەکەم:** پ1، لا (III)، دێڕی (5...) "ئەمە جگە لەوەی کە چەندین ڕێوڕەسمەو سورەتی پیرۆزیان لەوان وەرگرتووە کردوویانە بەهی خۆیان: لەوانە وەك حەرامو حەڵاڵ، ڕەجم کردنی زیناکەر، حەج و تەڵاقو فرەژنیو، پەرستنی بەردە ڕەشەکەی کەعبە، خەتەنەو پشووی ڕۆژانی هەینی.."

وەرگێڕ باس لە بابەت دەکاتو بێبەڵگەو دەستەوسان دادەمێنێت، هۆکەشی ئەوەیە کە ئەو قسانەی دەیکات هیچ بەڵگەیەکی نییە، ئەگەرنا باسی دەکردن، ئەوەتا باسی ڕێوڕەسم دەکات کە نازانێت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (خالفوا النصاری والیهود)[1] واتە: لە هەموو شتێکی مەراسیمیدا پێچەوانەی جولەکەو گاوربن، نەك لەوانیان وەرگرتووە، سەبارەت بە سورەتی پیرۆز، نازانم مەبەستی چییە، ئەگەرنا حەرامو حەڵاڵ سورەت نین ئەوەشی سادەترین شارەزایی هەبێت لە ئایینی ئیسلام دەزانێت ئەم دوو بابەتە حوکمی بابەتەکانن، سەبارەت بە ڕەجم کردنی زیناکەرو فرەژنیو پشووی هەینی لە هیچ کام لەو دوو ئایینەدا نینو لە مەسیحییەتدا فرەژنی زۆر قەدەغەیەو جولەکەو گاوریش لە ڕۆژی هەینی پشوویان نییەو ئایینی ئیسلامیش دووبارە ژیانی مرۆڤەکانی ڕێکخستووەتەوەو ئەوشتانەی لەناو ئاینەکانی دیکەدا هەبن هەر ئاینو ئەنجامەکەی ئەوەیە کە خودا خاوەنی ئەو حوکمانەیە.

جگە لەوەی ئەحکامی هاوبەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەم ئایینانە یەك سەرچاوەیان هەیە.

سەبارەت بە: پ1، لا3، دێڕی (3) (لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دایکی لە دەستدا)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە منداڵیدا دایکی لە دەستدا، تەمەنی (شەش) ساڵان بوو بە پێی سەرچاوەکانی مێژوو[2].

**دووەم:** پ2، لا 3 دێڕی (4) ".. بەڵام هێشتا کتێبێکی ڕوونو مەنتیقی لە بارەیەوە نەنووسراوە کە تیایدا ئەو پیاوە دوور لە تەپو تۆزی مەبەستو گومانو دەمارگیری نیشان بدات".

---

[1] أخرج البخاري ومسلم والنسائي (إن الیهود والنصاری لا یصیغون فخالفهم)) ص118، نیل الاوطار، ج1، المجلد الاول، الشوکاني.

[2] السیرة النبویة، ابن هشام، ص168، ج1، السیرة النبویة، د. علي محمد محمد الصلابي، البدایة والنهایة، لابن کثیر، ص308، المجلد الاول، ج2، ص71، ج2.

بەڕاستی هەندێك پەرەگراف جێگەی ئەوەیە بڕیار لەسەر کتێب بە زانستی ئەو کتێبە یان نازانستی بدات، دەکرێت هەندێجار لەکاتی نووسیندا جۆرێك لە دژایەتی و پێچەوانە بنووسرێت، بەڵام نەك وەك ئەم نووسەرە کە زۆرجار شت نەقڵ دەکات بەتەواوی پێچەوانەی ئەوەی پێش خۆی، لەم پەرەگرافەداو لەسەرەتاوە باسی هەزاران کتێب دەکات کە لەسەر ژیانی حەزرەت نووسراوە، پاشان دەڵێت، "ئەم پیاوە زیاتر لە سەرجەم پیاوانی مێژوویی بەرلەخۆی بەڵگەنامەو زانیاریو یاساکانی کەوتوونەتە بەردەستی لێکۆڵەرو توێژەرەوەکان".

**سێیەم:** پ3، لا3، دێڕی (1..) (مسوڵمانانیش لایان لە مێژووی ڕاستەقینە نەکردووەتەوە هەمیشە هەوڵیان داوە لە "محمد" کائینێکی خەیاڵی..".

لەبەشێکی پێشەوەی ئەم نووسینەدا باسم لەوەکرد کە نووسینو ڕەخنەگرتن لە ئیسلامو بەرنامەو مێژووەکەی کارێکی ئاسان نییە، بە تایبەت بۆ کەسێکی نەخوێندەواری وەك نووسەرو وەرگێڕی ئەم کتێبە، چونکە هیچ کەسو گەل و نەتەوەیەكو میللەتێك بە ئەندازەی مسوڵمانان بەدوای مێژووی ڕاستەقینە نەگەڕاون، ئەوەتا لە مێژووی ئیسلامی و گەلانی پێش ئیسلامدا بەهەزاران موجەلەداتیان نووسیوە، بە تایبەت لە مێژووی ئیسلامیدا، ئەگەر باسیان بکەین بەتەنها کتێبێك کۆتایی نایەت، تەنها بۆ ژماردن (السيرة النبوية لابن هشام، البداية والنهاية لابن كثير، التأريخ الاسلامي لمحمود شاكر، مقدمة ابن خلدون، تأريخ خليفة بن خياط، تأريخ الامم والملوك لابن جرير الطبري، المنتظم في تأريخ الملوك والامم لابي الفرج ابن الجوزي، الكامل في التأريخ لابن الاثير، العبر وديوان المبدأ والخبر لابن خلدون).

سەبارەت بە ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامییش کتێبی مێژوویی زۆر بەنرخ نووسراوە، لە وانە (فتوح البلدان للبلاذري)، سەبارەت بە فتوحاتی دەوڵەتی ئیسلامیی (سمط النجوم العوالي في أنباء الأوائل والتوالي، لعبد الملك العاصي) لە بارەی مێژووی حیجاز (الخطط مقريزى)، لە بارەی دەوڵەتی مەمالیکی میسرو هەورەها (النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة)و مێژووی ئەندەلوس و مێژووی دەوڵەتی عوسمانی و ...هتد.

لەگەڵ ئەمانە هەمووی تەحقیق کردنی ڕووداوەکان بەپێی زانستی جەرحو تەعدیل کە بەتەحەداوە دەتوانین بڵێین هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی جیهانی نییە کە وەك سەرچاوەکانی ئیسلامیی پاکسازیی کرابنو هیچ زانستێك نییە لە جیهاندا بە ئەندازەی زانستی جەرحو تەعدیلو ناسینی پیاوانی قسە لاوازو درۆزن کە پێی دەوترێت (الضعفاء والمتروكين)و لە وەرگێڕانی (رجال الصحاح)، بۆیە هیچ مێژوویەك بە ئەندازەی مێژووی ئێمەی مسوڵمان پاك نییە، بەڵام چی بکەین لە ئاستی نەخوێندەوارانی ئەمڕۆی بەکرێگیراو.

**چوارەم:** پ4، لا3، دێڕی (1...) "هەرلەتەمەنی منداڵییەوە تا ساڵی (610)ی زاینی، واتە ئەوکاتەی کە تەمەنی گەیشتووەتە چل ساڵ، هیچ بەرهەمو شوێنەوارێکی گرنگ لە مێژووی ئەم منداڵەدا نییە، تەنانەت لە ژیاننامەو سەرگوزشتەکانی ئەو سەردەمەشدا بەڵگەیەکی ڕوونو نائاساییمان بەرچاو ناکەوێت".

نووسەرو وەرگێڕیش ئەوەیان لە بیرچووە ئەم پەرەگرافەیان نووسیوە، ئەگەرنا پاش چەند لاپەڕەیەك لە ژێر سەردێڕی (منداڵی) لە لاپەڕە (14 – 21) باسێکی درێژ لە ژیانی منداڵیی حەزرەت باس دەکاتو بەشداری کردنی لە شوانیەتیو بیرکردنەوەی لەو ژیانەی کە خۆیو خەڵکی تێدایە، منداڵێکی زیرەكو هەستیارو، ...، دەڵێم: یان ئەم باسە درۆیەو هەڵبەستراوی نووسەرە، یان پەرەگرافەکە وانییە، بەبڕوای من هیچیان ڕاست نین، نەپەرەگرافەکە نە تەحلیلەکە، چونکە تەحلیلەکە باسی هیچ سەرچاوەیەك ناکات، تەنها خەیاڵاتی نووسەرەو هیچی تر، سەبارەت بە پەرەگرافەکەش حەزرەت لە سەرەتای ژیانییەوە تا (610)زاینی، واتە کاتی هاتنی وەحی ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە ناو گەلەکەیدا، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

1. ئەوەتا نووسەر لە پ2، لا23دا دەنووسێت "ئەمجۆرە حاڵەتە لە سەردەمی منداڵیی محمد هەبووەو لە سەفەرکردنەکانی بۆ شام تەنیا بەبازرگانییەوە نەوەستاوە، بەڵکو لەگەڵ ڕێبەرانو کە شیشانی مەسیحیدا بە بەردەوامی پەیوەندی هەبووەو تەنانەت لەکاتی تێپەڕبوونیدا بەناو زەمینو خاکی (عاد)و (ثمود)و (مدين)دا گوێی بۆ ئەفسانەو

چیرۆکەکانی ئەوان ڕاگرتووەو لە خودی مەککەدا لە گەڵ ئەهلی کتێبدا پەیوەندی هەبووە، ڕۆژانە چەندین سەعات لە دوکانی (جبر) دەمایەوەو لە گەڵ (وەرەقەی کوڕی نوفل)دا پەیوەندی بەردەوامی هەبووە".

2. پ1، لا31 دێڕی (1-3) نووسەر دەنووسێت "حەرا کێوێکی بەردینو وشکە، بەقەدپاڵی ئەم کێوەوە ئەشکەوتێك هەیە کە حەنەفییەکانی زاهید ڕوویان تێکردووەو ... ماوەیەك محمدیش هەر وایکردووە...".

ئەمەی پێشوو لە شاهیدیەکانی نووسەرە، هەرچەند لەلای من نووسەرو وەرگێڕ بە شاهید قەبوڵ ناکرێن، بەڵام ئەو دوو پەرەگرافە بۆ ئەوەی (لەزاری خۆیانەوە بەڵگە بدەینەوە بەڕوویاندا). سەبارەت بە مێژوو سەرنجی ئەم خاڵانەی خوارەوە بدەن:

1. گەیشتنی بە (بحیرا)، خواپەرستی مەسیحییەکان، لەکاتێکدا کە لەگەڵ مامی چوو بۆ شام پاش ئەوەی (بحیرا)، دەیناسێت کە ئەمە پێغەمبەری ئاخر زەمانە، داوادەکات لە مامی بیگێڕێتەوە بۆ مەککە، ئەویش دەیگێڕێتەوە، ئایا ئەمەش نابێتە بەڵگە؟، مادەم مامی بڕوای نەهێناوە بە ئیسلام، کەواتە ئەم چیرۆکە ڕاستی نییە، چونکە باسی ئەوەمان کرد، کە ئەبوتالیب لە بەر عەیبەی قوڕەیش ئیمانی نەهێناوە، باسی ئەوەشمان کرد کە هیدایەت دوو بەشەو کەسێك موستەحەق نەبێت پێی وەك ئەبو تالیب بە نسیبی نابێت.

2. بەشداریی کردنی لە جەنگی فوجار، کاتێك کە تەمەنی (14) ساڵان بوو کە خۆی حەزرەت باسی دەکات، ئەوەندە منداڵ بووە تەنها تیر کۆکردنەوەی کردووەو داویەتی بەمامەکانیو ڕۆڵی خۆی بینیوە.

3. لە تەمەنی (25) ساڵیدا بەشداریی کردووە لە (حلف الفضول) کە ئەو پەیمانە بوو کە لەنێو پیاوچاکانی قوڕەیشدا بەسترابوو بۆ بەرگری کردن لە ستەملێکراوانو مافخوراوان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە حەزرەت شوێنو پێگەی تایبەتی خۆی هەبووە، چونکە لەوکاتەدا خەڵکی بەتەمەنی قوڕەیشو ئاقڵەکانیان لە و جۆرە پەیمانەدا بەشدارییان دەکرد.

4. بانگکردنی لەلایەن خەدیجەوە (خوا لێی ڕازی بێت) بۆ سەرپەرشتی کاروانی بازرگانیی، لەکاتێکدا ئەم پلەیە بەکەسێك دەدرێت لە بواری ئابووریو ئەخلاقیدا لە ئاستێکی بەرزدا بێت، دیارە ناوبانگی حەزرەت وای کردووە کە خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەم ئەرکەی پێبسپێرێت.

5. بەشداریی کردنی لە دروستکردنەوەی کە عەبەداو دانانی پیرۆزترین بەرد لە نێو چینی دیواری ئەمماڵەدا لەسەر پێشنیارو ڕای حەزرەت وایکرد کە ئاگری فیتنەی خۆپەرستی ئەو سەردەمەی هۆزەکانی مەککە بکوژێنێتەوە، کە ئەم عەقڵ دروستییەو ئەم پێشنیازە لە کەسێکی سادەوە نایەت، چونکە دەمارگیریی عەرەبی پێش ئیسلام لە ڕادە بەدەربوو، تا گوێ لە پێشنیازی کە سێکی سادە بگرن، کەواتە پێگەو شوێنی حەزرەت لە ناو هۆزەکەیدا وای کردووە بەمشێوەیە گوێی لێبگیرێت.

ئەمە سەرگوزەشتەیەکی کورتی ژیانی پێش پێغەمبەرایەتی حەزرەت بوو، (ﷺ) لە ئاست درۆ هەڵبەستراوەکانی نووسەرو وەرگێڕ.

**__پێنجەم:__** پ3، لا4، دێڕی (1-5) "پێش هاتنە خوارەوەی وەحی هاتو هاوارێك لە مەککەدا بڵاوبۆوە کە پێغەمبەرێك بەناوی (محمد)ەوە دێتو ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتی جیهان دەکەوێتە ژێر فەرمانو دەسەڵاتییەوە، گوایە لەو ڕۆژگارەدا چل ژن لە مەککە دووگیان بوونو هەرکامەیان کە منداڵی دەبوو ناوی کوڕەکەی دەنا (محمد)، بەڵکو ئەو پێغەمبەرە دەرچێت کە دەڵێت دێت".

لەم پەرەگرافەدا نووسەر ئیدیعای ئەوە دەکات کە (محمد بن جرير الطبري) لە پەراوێزی ڕاڤەی ئایەتی (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا..) سورەتی البقرة (23) نوسیویەتی.

بێئاگایی ئەم نووسەرە لەوەدایە کە شتێك دەنووسێت بیر لەوە ناکاتەوە بزانێت چۆن دەینووسێت، ئەوەتا سەرەتای پەرەگرافەکەی لەگەڵ ئەو باسەی کە دەیەوێت، ماوەی نێوانیان (40) ساڵیان نێوانە، پاشان تەفسیری (تەبەری) گەڕام هیچ ئاماژەیەکی بۆ ئەم باسەی نووسەری تێدا نییەو ڕاڤەی ئەو ئایەتەش هیچ پەیوەندییەکی بە باسەکەوە نییە، ئەوەی

کە دەڵێت چل ژن لە مەککە دووگیان بوون ناوی منداڵەکانیان دەنا (محمد)، لە هیچ کتێبێکی مێژووی ئیسلامدا ئەوەی لە بەردەستم بوو نەمدی، ئەوەشی کە هەیە لە سەر ئەم بابەتە لە (السیرة النبویة)و (البدایة والنهایة) پاش تەحقیق دەرکەوت کە هەر هەمووی کۆمەڵە هەواڵێکی لاوازو لە ڕووی ڕاستیی و دروستییەوە وەرناگیرێن، بۆیە لە پێشیشدا ئاماژەم بۆ ئەوەکرد کە نووسەر لەبەرئەوەی شیعەی ئێرانییە، زۆر خولیای چلەن، بۆیە باسی چل ژن دەکات!، چونکە خۆشی ئەمە ڕەد ناکاتەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە نووسەر، نەك هەر ئەمانەتپارێز نییە، بوختان بۆ ئیبن جەریر دەکات، خۆشی لە وە گێل دەکات کە چۆن سەرچاوەی ئیسلامیی نەقڵ دەکرێت، لە وەش کێشەتر ئەوەیە نووسەر هەرچی لە ناو کتێبدا بێت و بوترێت ئەمە مێژووی ئیسلامە، بەبێ دوو دڵی و تێڕامان وەریدەگرێت بەتایبەت ئەگەر بابەتی سەلبی لە خۆ بگرێت!!، سەبارەت بەوەی کە دەڵێت "پێش هاتنە خوارەوەی وەحی هات و هاوارێك لە مەککە بڵاوبووە کە پێغەمبەرێك بەناوی (محمد)ەوە ..."، وەڵامدانەوەی بەهەمان قسەی نووسەر بەمافی خۆم دەزانم بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت نووسەر چۆن قسەی کردووە، کە دەڵێم بێئاگایی ئەم نووسەرە لە وەدایە وا دەزانێت شتێك ئەو نەیزانێت ئیدی ڕوی نەداوە، عەرەب دەڵێت (الانسان عدو لما جهله).

هەر بۆیە ئەم ڕووداوە لە خاڵی سیانزدەهەم لە بەرپەرچدانەوەی پ3، لا11 لە کۆتاییدا باسم لەو بەڵگەیە کردووە.

**شەشەم:** پ5، لا4 دێڕی (1-4) "واقدی بەشێوەیەکی تر لە بارەی لە دایکبوونی (محمد)ەوە دەدوێت (هەر کە لەدایکبوو وتی (الله أکبر) لە مانگی یەکەمدا بە سنگە خشکێ دەڕۆیشت...)".

سەبارەت بەم پەرەگرافە پاش گەڕانێکی زۆر بەدوای سەرچاوەکەیدا بۆم دەرکەوت کە واقدی شتی وای نەوتووە، بەڵکو لە بەشی دووەمی (البدایة والنهایة) لا (292) هاتووە کە واقیدی باسی لە دایکبوونی حەزرەت دەکات هیچ بڕگەیەك لەمەی نووسەری تێدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی واقیدی نەقڵی کردووە لە و لاپەڕەیدا سەبارەت بە لە دایکبوونی حەزرەت، قسەیەکی لاوازە، لە ڕووی زانستی فەرمووددەوە وەرناگیرێت[1] جا چۆن وتراوە؟ ئەمە جێگەی نییە، ئەمما سەبارەت بە وتنی وشەی (الله أکبر)، قازی عیاز نەقڵی کردووە بەمشێوەیە (لە شیفائی دایکە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە) کە مامانی دایکی حەزرەت بوو، دەڵێت "کاتێك حەزرەت کەوتە سەردەستم پاشان (استهل) واتە وتی (الله أکبر)[2]، بەڵام لە کتێبەکەی خۆیدا (شرح الشفاء) بەمشێوەیە بوو (شفائی دایکی عەبدوڕەحمان) دەڵێت: "کاتێك حەزرەت کەوتە سەردەستم وتی (الله أکبر)و پژمەیەکی کرد"، هەروەها (دلجی) دەڵێت "تەنها پژمەیەکی کردووە، نەك وشەی (الله أکبر)ی وتبێت[3].

هەربۆیە زۆرێك لە و بابەتانەی لە بارەی لە دایکبوونی حەزرەتەوە وتراون بنچینەیەکی ئەوتۆیان نییە، سەیری (البدایة والنهایة)ی تەحقیق کراو بکە، بۆیە نووسەر بەهەڵەدا چووەو ئیسلامیی تێدا تاوانبار کردووە، کە ئیسلام بێبەریە لەو تاوانە هەڵبەستراوانەی نووسەرو وەرگێڕ.

**حەوتەم:** پ3، لا5، دێڕی (10) "گومان لە وەدا نییە کە (محمد) لە ناو تایەفەی خۆیدا جیاوازەو لایەنی جیاوازیشی بریتییە لە هۆشی تیژ، بیری قوڵ و ڕۆحی بێزاری لە وەهم و گومان و خورافاتی باوی سەردەمەکەی خۆی، لە هەموان گرنگتر ئەوەیە کە خاوەن هێزو ئیرادەو توانایەکی لە ڕادەبەدەرە کە ئەوی بەتەنیا بەرەو شەڕی ئەهریمەن ڕادەکێشا، بەزمانێکی گەرم خەڵك لە فەسادو خراپەکاری دووردەخاتەوە، ڕەوشتی ناشیرین و تاوان و درۆو خۆویستی سەرزەنشت دەکات، لایەنگری لەچینی بێبەش و ستەمدیدە دەکات، قەومەکەی خۆی لەو گەمژەییە سەرکۆنە دەکات..".

ئەمەی سەرەوە شایەتی نووسەرە لەسەر حەزرەت و دیارە قەناعەتی خۆیەتی، بەڵام کەسێك کە شایەنی ئەوە نەبێت خوا هیدایەتی بدات، با قەناعەتی وای هەبێت، هەر هیدایەت وەرناگرێت، وەك مامی پێغەمبەر (ﷺ) هەمان قەناعەتی هەبوو

[1] البدایة والنهایة لابن کثیر، ص292، المجلد الاول، الجزء الثاني، ط 2005م، دار ابن رجب.
[2] هەمان سەرچاوە.
[3] شرح الشفاء، ملا علي القاريء، ص751، المجلد الاول، قاضي عياض، ط2001.

به موحەممەدو ئیمانی نەهێنا، بە واتایەکی دیکە مەرج نییە بەمامی پێغەمبەر قەناعەتی بە موحەممەد (ﷺ) نەبووبێت، بۆیە باوەڕی پێنەهێناوە، ئەمەی ئەمیش بەڵگەی زیندووە، لە لایەکی دیکە نووسەر باس لەوەدەکات کە حەزرەت لە ناو قورەیشدا بەکەسێکی ئاسایی دەژمێردراو هیچ جۆرە ئیمتیازێکی نەبوو، لا6 دێڕی (1-2)، پ2، ئەگەر لە هەرکەسێکی ژێر بپرسیت، ئایا دەکرێت کەسێك ئەمە سیفاتی بێت لە ناو قەومەکەیدا، لە کاتێکدا نووسەر ئاماژە دەکات بە وەهم و خورافیات، دەبێت کە سێکی ئاسایی بێتو هیچ پێگەیەکی تایبەتیی نەبێت.

دەکرێت پیاوێك لە لای کافران ناسراو بێت بە (الصادق الامین) و لای نووسەری ئەم کتێبەو وەرگێڕەکەی ئەم سیفاتە چاکانەی هەبێت، دەکرێت بەناوی خواوە قسەبکاتو کتێبێك دابنێتو بیشڵێ ئەمە قسەی خوایە.

ئەم تەسەورە مەگەر بەس نووسەرو وەرگێڕو هەندێ عەقڵ سادەی وەك ئەوان بیڵێن، کەس ئەوەی بیستووە کتێبێك لە سەرتاسەری جیهانی ئەمڕۆو ئەوساش لە جەزیرەی عەرەبیدا تاکە کتێب بێت هەموان بیناسن بەوەی زۆرترین یاساو ڕێسای چاکی کۆکردووەتەوە خاوەنەکەی ذکۆڵی لەوە بکات کە هی خۆی نییە؟! ئەوەشی جێگەی سەرنجە لەم پەرەگرافەدا ئەوەیە نووسەر باسی (ئەهریمەن) دەکات کە خودای شەڕە لە لای زەردەشتییەکان، چونکە ئێرانیانی شیعە بە تایبەت ئەوانەیان کە لایانداوە خۆیان بە شوێنکەوتەی خودای چاکە دەزانن، ئەوەشی عەقڵی نووسەرێکی سەدەی بیستە کە قەناعەتی هەبێت بەخودای خراپە، واتە (ئەهریمەن)، خودای چاکە، واتە (یەزدان).

**هەشتەم:** پ2، لا7، دێڕی (2-5) "...بەڵام پاش مردنی ئەو ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبێت، بە ڕادەیەك کە ئەم ڕێبەرە پاش ماوەیەك بەهێزی گومانو خەیاڵاتو تەسەورات ئیتر لە بەشەربوون دەردەچێتو دەبێتە کوڕی خودا، هۆی سەرەکی بۆ دروستبوونی دنیاو تەنانەت دەبێتە بەڕێوەبەرو هەڵسوڕێنەری جیهانیش".

ئەوەی ئەم پەرەگرافە بخوێنێتەوە وا هەست دەکات باسی حەزرەتی مەسیحەو فەلەیەکی توندڕەو دەیکات، بەڵام تائێستا هیچ کە سو تاقمو لایەنێك بوختانی ئاوایان نەداوەتە پاڵ حەزرەتو هاوەڵانی و هەڵگرانی بەرنامەکەی، بەبڕوای من ئەمەی نووسەر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەندێك خەڵك هەبن لە ئێران کە لە ناوچەی (صەحنە) لە نزیك شاری کرمانشاه دادەنیشن پێیان دەوترێت (علی اللهی)ەکان، واتە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخودا دەزانن، بۆیە دەکرێت نووسەریش لە ناو شیعەدا سەر بەو تائیفەیە بێت، ئەگەرنا هیچ بەرنامەیەکی ئاینی بە ئەندازەی ئیسلام مافی بەشەربوونی بۆ حەزرەت نەپاراستووە.

**نۆیەم:** پ1، لا80، دێڕی (5) "...لێرەدا تەنها شێوەیەکی سادەو حیکایەتێکی مەعقول تر لە ڕاڤەو تەفسیرەکانی (جلالین) دێنمەوە، چونکە ئەم تەفسیرە باشترینو بایەخترینیانەو...".

خۆزگە بزانرێت نووسەر ئەم شایەتییە بە چ مەبەستێك دەدات، تۆ بڵێی قەناعەتی تەواوی بەو قسەیەی خۆی هەبێت، یان ئەمە قسەی خەڵکی دیکەیەو ئەم بووە بەوەکیلیان.

سەبارەت بە تەفسیری جەلالەین، تەفسیرێکەو هیچ کەس تەحقیقێکی نەکردوە، هەردوو نووسەرەکەی لەسەر ئەو بابەتەی کە بیستوویانە نووسیویانە، هەربۆیە شتی زۆر باشی تێدایەو شتی زۆر خراپیشی تێدایە کە ئێرە جێگەی ئەوە نییە باسی بکەم، بەڵام بۆ زانینی باشترین تەفسیر دەڵێم[1]: ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: تەفسیری (ابن جریری طبری) باشترینو ڕاسترین تەفسیرە لە ئەحکامی ئیسلامدا[2]

**دەیەم:** پ3، لا8، دێڕی (5.1) "بەهەرحاڵ ئەو وتەیەی لە زمانی پێغەمبەرەوە وەریانگرتووە بێبەڵگەیەو تەنانەت ئاماژەیەکیش بەوە ناکەن کە ئەم وتەیە کام حیکایەتخوان وتویەتی، هەرچەند ئەم حیکایەتخوانە جێگای متمانە بێت..".

ئەمە بەشێکە لەو پەرەگرافەی کە نووسەر گومانی لە ڕووداوی ئیسراو میعراج هەیەو بەیانی ئەوەش دەکات کە هەردوو ڕاڤەکەری جەلالەین لەو حیکایەتە دڵنیانینو زیاتریش دەڕوات، لە لا(9)ی پەرتوکەکەیدا دەڵێت "بەڵام ئاشنابوون بە

[1] پێشتر باسی جۆرەکانی تەفسیرمان کرد، بۆیە دووبارەی ناکەمەوە.

[2] الجامع في طلب العلم الشريف، ج2، عبدالقادر عبدالعزيز، ص682، ط1415ه.

نووسراوەکانی قورئان کە ڕووداوی (23) ساڵەی سەردەمی پێغەمبەرایەتی محمدی تێدا باسکراوە ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە حەزرەتی موحەممەد شتێکی لەم بابەتە نەوتووەو ئەمە تەسەوراتو خەیالاتی ئەفسانەییو..".

سەرەتا ئەوە دەڵێم نووسەر لە هەر شتێکدا ئارەزووی لێبێت ڕەخنەی هەبێت لە سەر ئیسلام، نەك هەر فەرموودەی لاوازی قەبوڵە، بەڵکو قسەی هەڵبەستراوو بێبناغەش دەکاتە بەڵگەو پێشی لە سەر دادەگرێت.

ئاماژەش بەوەی کە نووسەر لە سەرەتای قسەکانیدا باسی بێبەڵگەیی ئەم ڕووداوە دەکات، دەبوایە بەڵگەیەکی هەبوایە، هەرچەند درۆش بێت، بەڵام با بێینو بگەڕێین: ئەوەتا لە کتێبی (السیرة النبویة)ی (د. علی محمد محمد الصلابي) بەشی یەکەم، چەند فەرموودەیەك دەهێنێتەوە بەدرێژی باسی ئەو ڕووداوە دەکات لە لا (288) بەشی یەکەم، فەرموودەکانیش بە ژمارەی (162) مسلمو (3207) بخاريو (164) مسلم [1]، هەروەها کتێبی (شرح الشفا) ملا علی قاریو لە (385، 387، 421) بەدرێژی باسی ئەو ڕووداوەی کردووە [2]، بەهەمان شێوە لە کتێبی (البدایة والنهایة) لە لا (115) بە درێژی باسی ئەو ڕووداوەی کردووە سەرجەم ژمارەی فەرموودەکانی بخاريو مسلمو ترمزيو نەسائی هێناوە [3]، بەهەمان شێوە لە کتێبی (السیرة النبویة)ی ابن هشام لە لا (396) هاتووە [4].

ئەوەشی کە فەرموودەناسەکان بەتێکڕا وا دادەنێن ڕاسترین کتێب دوای قورئان، سەحیحی بوخاریە کە نووسەر بڕوای پێی نییە.

ئەوەشی کە دەڵێت لە لا (9)دا کە حەزرەت شتی وای نەوتووە، درۆیەکی حاشا هەڵنەگرە، پشتبەستن بەوەی سەرەوە، پێش هەموو ئەمانەش ڕووداوی ئیسراو میعراج دەقی قورئانی لەسەرە کە گومان هەڵناگرێت.

**یازدەهەم:** پ3، پ4، لا(9) "(قل سبحان ربی هل کنت الا بشرا رسولا) واتە من بەشەریکم لە لای ئەوەوە هاتووم، لە ئایەتی (51)ی سورەتی (شوری)دا دەڵێت: (وماکان لبشر أن یکلمە الله الا وحیا) واتە ئەم بوارو دەرفەتە بەهیچ کەسێك نەدراوە کە خودا قسەی لەگەڵدا بکات تەنها لە ڕێگەی وەحییەوە نەبێت".

ڕوودەکەمە نووسەرو دەڵێم: کە تۆ دەتەوێت خۆت دۆگما بکەیت بۆ هەوڵ دەدەیت ئێمەش وەك خۆت لێبکەیت؟، تۆ کە عەقڵت جام بووە بەکاری ناهێنی، گوناهی عاقڵان چییە؟ ئەوەی زۆر جار بێ تاقەتم دەکات بێئاگایی ئەم نووسەرەیە کە وادەزانێت تەنها ئەو دەتوانێت ئایەت بخوێنێتەوەو لێی تێبگات، ئەگەرنا وای نەدەنووسی. هەربۆیە خوێنەری بەڕێز با لای تۆ ڕوون بێت هەر دەقی ئایەتی دووەم کۆتاییەکەی باسی ئەوە دەکات کە دەفەرمووێت (أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ) ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکە لە سورەتی (النساء) ئایەتی (169) (وکلم الله موسی تکلیما)، ئەوە دەردەخات کە ڕاستەوخۆ خودا قسەی لەگەڵ موسی کردووە، نەك ئەوەی نووسەر لێی تێدەگات.

**دوانزەهەم:** پ1، لا10، دێڕی (1–5) "بەبوونی وەحی ئیتر پێویست بەچوون بۆ ئاسمان ناکات، باوای دابنێین پێویستە، بەڵام چوارپێی باڵدار بۆچی؟، ئایا ڕێگای ئاسمان لە (مسجد الاقصی) وەیە".

بێئاگاییو بێ سەروبەرەیی ئەم نووسەرە وا دەکات هەندێ جار وەڵامی زبر بدەمەوە، چوون بۆ ئاسمانەکان لە دوای ساڵی (دڵتەنگی) بوو کە حەزرەت ئاشنا ببێت بە پێغەمبەرانو نوێژی فەرزی پێ بوترێت، لە ئاسمانەکانو لە خودا نزیك بکەوێتەوەو وەك موعجیزەیەکیش بدرێتەوە بەدەمی بێباوەڕاندا، ئەوەشی باسی چوارپێی تێدا کراوە، بۆ نزیککردنەوەی ئەو واقیعەیە کە دەبێت وەسیلەیەك هەبێت، چونکە لە دەسەڵاتی خودادا هەیە کە بەبێ وەسیلە بیبات بۆ قودس، پاشان بۆ ئاسمانو ئەوەش بزانیت ئەو چوار پێیە تەنها لە مەکەوە بۆ قودس بووە لە وێشەوە پێی گەڕاوەتەوە.

---

[1] السیرة النبویة، د. علي محمد محمد الصلابي، ص388، ج1، ط2004.

[2] شرح الشفا، للقاضی عیاض، ملا علي القاريء، ص385 -421، المجلد الاول، ط2001م

[3] البدایة والنهایة لابن کثیر ص115 المجلد الثاني (جزء 3 -1، ط2005.

[4] السیرة النبویة، لإبن هشام، الجزء الاول، ص396، المکتبة العلمیة.

**سیازدەهەم:** پ3، لا11، دێڕی (1-4) "لەدایکبوونی (محمد) وەك لەدایکبوونی ملیارەها منداڵی تر بووەو هیچ نیشانەو ڕووداوێك ڕووی نەداوە، بەڵام نەخۆشی موعجیزەسازی خەڵکی بەرەو خەیاڵات و ئەفسانەکان ڕاکێشاوە، ئەوەتا بەبۆنەی لە دایکبوونی (محمد)ەوە دەڵێن (هیوانی مەدائین) قڵیشاوەو ئاگردانی فارس کوژاوەتەوە".

بەرپەرچدانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان، کارێکی ئەکادیمی و شارەزاییەکی گەورەو لێهاتووییەکی بەتوانای دەوێت، بۆ ڕێکخستنی بەڵگەکان، چونکە ڕووداوێك باسی دەکرێت دیارە بەڵگەی خۆی دەبێت بۆ ئەوەی بچەسپێت لە مێشکی ئەوەی کە باسەکەی بۆ دەکرێت و دەبێت ئەو بەڵگەیەش ئەوەندە مەنتیقی بێت لە ئاستی وەرگرتنی ئەو کە سەدا بێت.

بەهەمان شێوە. بەرپەرچدانەوە دەبێت بەڵگەکانی بەهێزترو مەنتیقی ترین لەوەی کە پێی جێگیر بووە، ئەگەرنا هیچ کاریگەرییەکی نابێت، هەربۆیە بابپرسین نووسەری هیچ لەبارا نەبوو چیت پێیە بۆ ئەو مەبەستە؟، ئەی بەڵگەکانت کوا؟ نییە، تەحلیل و شیکردنەوە بێ سەلیقەییەکەت بۆ نەخستووەتە کار؟ نازانم، کەواتە قسەی بازاڕییەو هیچ بنەمایەکی زانستی نییە، خۆ ئەگەر بپرسین ئەی مێژووی ئیسلامیی چی تێدایە باس لەم ڕووداوە بکات، بەدڵنیاییەوە ئەوەی سەرەتایەکی سادەی لە ژیانی حەزرەت بیستبێت هەندێك باسیان بۆ کردووە، بەتایبەت لەو بابەتەی نووسەر باسیان لێوە دەکات، هەرچەندە لە ئەنجامی گەڕان بەدوای ئەو بابەتەی وەك (شەقبوونی هەیوانی مەدائین)و (کوژانەوەی ئاگردانی فارس) ئەو فەرموودانەی کە دەگێڕنەوە، یان ئەو کە سانەی کە گێڕاویانەتەوە پلەی ڕاستیان وەرنەگرتووە، بەوە نابنە ماڵ لەسەر مێژووی ئیسلامیی، بەڵام چەند ڕووداوێکی ڕاست و دروست هەیە لە مێژوویی ئیسلامدا کە نەقڵی مێژووی ئیسلامیی لە سەر شێوەی زانستی فەرموودە وا دەکات بەتەحەدداوە بڵێین ڕاسترین مێژووە، هەربۆیە لێرەدا چەند نموونەیەك نەقڵ دەکەین، لەوانە "دەگێڕنەوە کە جولەکەیەك لە مەککەدا بازرگان بوو، لەو شەوەی کە حەزرەت لە دایك دەبێت، لە یەکێك لە مەجلیسەکانی قورەیشدا دەڵێت ئایا ئەم شەو کەس لە ئێوە منداڵتان نەبووە؟، مەجلیسەکەش دەڵێن نازانن، ئەویش دەڵێت. الله أکبر، ئەگەر بەهەڵەدا چووبن قەیدی نییە، بزانن و لە یادی کەن کە پێتان دەڵێم، ئەم شەو پێغەمبەری ئەم ئوممەتەی کۆتایی لەدایکبووە.

لەنێوشانیدا نیشانەیەك هەیە،... تاکۆتایی قسەکان، پاشان دەگەڕێتەوە کە دەپرسن دەڵێن عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب منداڵێکیان بووە ناویان ناوە (محمد)، پاشان هەواڵ دەدەن بە جولەکەکەو دەچن لەگەڵیدا بۆ سەیرکردنی، پاشئەوەی جولەکەکە سەیری نێو شانی دەکات و نیشانەکە دەبینێت دەبووڕێتەوەو پاش بەهۆش خۆی دێننەوەو هاوار دەکات پێغەمبەرایەتی لە دەست بەنی ئیسرائیل چووە"، بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە (108/1)[1].

هەروەها لە حەسانی کوڕی سابتەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێت، "منداڵێکی حەوت ساڵان یان هەشت ساڵان بووم، ئەوەی دەمویست و دەمبینی دەمزانی ڕاست ناڕاست لە یەك جیا بکەمەوە، بیستم لە جولەکەیەکی یەهودی لە شاری یەسریب (مەدینە) بەیانییەك هاواری دەکرد: ئەی خەڵکی جولەکە، تاکۆبوونەوە لێی و منیش گوێم گرت، دەیوت: ئەستێرەی (أحمد) ئەم شەو هەڵهاتووەو لە دایك دەبێت". أبونعیم، بەیهەقی ڕیوایەتیان کردووە[2].

هەروەها زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفیل، دەڵێت: "یەکێك لە پیاوە ئاینییەکانی شام پێی وتم: لە وڵاتەکەتدا پێغەمبەرێك دەرکەوتووە، یان دەردەکەوێت، چونکە ئەستێرەی هەڵهاتووە، بگەڕێرەوە باوەڕی پێبهێنەو شوێنیکەوە، ئەبی نعیم ڕیوایەتی کردووە[3].

**چواردەهەم:** پ1، لا13، دێڕی (1-4) "لەم نووسراوە کورتەدا بانگەشەی نیشاندانی (23) ساڵ لە تەمەنی (63) ساڵەی حەزرەتی محمد ناکەم، ناتوانم کەسایەتی و بەتوانایی هێزی ڕۆحی مرۆڤێك داڕێژم، کە دەبێت وەك (لینین) بە خولقێنترین بوونەوەری مێژوویی بەشەریت دابنرێت، بەو جیاوازییە..".

---

[1] البدایة والنهایة لابن کثیر، تحقیق مصطفى بن العدوي، المجلد الاول (جزء2) ص295.

[2] نفس المصدر.

[3] نفس المصدر.

سەرەتا دەبێت ئەوە بوترێت کە نووسەر بێتوانایی خۆی نیشان دەدات لە ئاستی بەتوانایی حەزرەت، بەڵام زۆرجار قیاسی حەزرەت دەکات لەگەڵ لینین کە بەسەر سوورمانەوە شیعەیەکی شیوعی بەدوو مەبەست دژ بە حەزرەت بوەستێت یەکەم، بەپێی بڕوای هەندێك لە شیعە توندڕەوەکان پێغەمبەرایەتی بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالیب هاتووەو حەزرەت دەستی کەوتووە، دووەم، تاکە بەرنامە لە ڕووی فکری شیوعیدا توانای وەستانی هەبوو بیروباوەڕی ئیسلام بوو، کە نووسەر لەبەر ئەم دوو هۆیە ئەوەندە دژایەتی ئیسلامو پێغەمبەرەکەی دەکات، بەڵام شتێکی سەرسووڕهێنەرە کە هەردوو خەندادکی شیعەگەرایی و شیوعیەتی یەکبگرن لە دژی پێغەمبەرەکەی، هەرچەندە نووسەر جار جار دەگەڕێتەوە سەر ئەسڵە شیعەیەتییەکەی و وەسفی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکات.

ئەو قیاسەی کە نووسەر دەیکات سەبارەت بە حەزرەت لە لایەك و لە لایەکی دیکە لینین، ڕابەری حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری زۆر جیاوازن و بەبڕوای نووسەر لینین کە سێکی زۆر هەڵکەوتوو خولقێنەر بێت، بەبڕوای زۆر کەس لینین ڕابەرایەتی چینێکی مەحرومی کرد، بە بیرۆکەیەك کە زادەی مارکس و ئەنگلز بوو، عەسرەکەشی چەند سەد ساڵێك بوو، ئەو فکرە هەبوو، پاشان پووکایەوەو ئێستا ژمارەی ئەوانەی شوێنکەوتەی ئەو بەرنامەن بە ئەندازەی ئەوانە نابن کە مشك و گاو گوێرەکە دەپەرستن، هەربۆیە نووسەر زۆر بەهەڵەدا چووە لەوبارەوە، چونکە کە سێکی وەك لینین لە سەردەمێکدا بووە کە خوێندن و نووسین و شۆڕشی پیشەسازی و زەمەنی فەلسەفەو تێکەڵ بوونی گشت شارستانیەتییەکان بووە، سەرجەم زانست و زانیارییەکان تا ئەندازەیەك کۆبوونەوەو وەك نووسەر دەڵێت، حزبێکی بەهێزو خاوەن بیروباوەڕ لە پشتی بووەو سەدان هەزار ناڕازی و شۆڕشگێڕی لە پشت بووەو بیرمەندی وەك مارکس و هیگڵ و ئەنگلزو سقرات و هیرقلیت و سەرچاوەی داڕێژراوی بیروباوەڕەکەی بوون، لەگەڵ ئەوەشدا زۆری نەخایاند پووکایەوە چووە خانەی بیرکردن و بەسەرچووەکان، بەڵام حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) لە پێش لینین بە ماوەی (1500) ساڵ لە ژینگەیەکی وشك و بێبەرەکەتی مەحروم لە هەموو ڕۆشنبیری و خوێندەوارییەك، موحەممەدێك (ﷺ) کە نەخوێندەوار بێت و نە مامۆستایەکی خوێندەواری هەبێت، نەتوانای هەبێت خۆی یەکلاکاتەوە بۆ نووسین و فێربوون و نووسەریش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە سەردەمی منداڵیی تا بوون بە پێغەمبەر هیچ ئاماژەیەك نییە سەبارەت بە دیاردەو دەرکەوتنی حەزرەت، ئەی چۆن و بە چ خێراییەك توانی لە یەککاتدا لە سەرجەم کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووریی و لەسەرووی هەمووشیانەوە کێشە ئاینییەکان یەکلایی بکاتەوە؟ خۆ بە وتەی نووسەر حەزرەت لە زۆر لایەن قسەی کردووە، سەبارەت بە ئیسلام زۆرێك لە نووسەرە جیهانییەکان بە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی زۆر بەهێز ناوزەدی دەکەن و سەبارەت بە سیاسەتیش، تا ئێستا ئیسلامو ئیسلامییەکان لە پێشەوەی بەرامبەرکێی دەوڵەتە دیکتاتۆری و ملهوڕەکانی جیهانن و لەزۆربەی وڵاتانی نەیاری سەرسەختی دەوڵەتە تۆتالیتارییەکانن و ململانێی شارستانی هەموو جیهان دەکەن و لە بواری ئابوورییشدا ئەو تیۆرە ئیسلامیانەی کە هەن خاڵێکی مەعقول و مەنتیقین، لە نێوان هەڵپەی سەرمایەداری و قۆرخی کۆمۆنیستیداو ئابوورییەکی زیندوو خاوەنی چەندەها پرەنسیپی گرنگی ئابووریی ئەم سەردەمەن و تەنها بانکە ئیسلامییەکان پشت و پەنای بازاڕی ئازادو کێبەرکێکانەو هاوکاری هەژارو نەدارەکانە، لە میانەی ئاینیشدا تاقە ئاینێکە کە بەبێ دەستکاری ماوەتەوەو گەشەو زیندووییەکەی لەوەدا دەبینرێتەوە کە ڕۆژانە لەو دەوڵەتانەی کە دژایەتی دەکەن ژمارەی باوەڕدارانی زیاد دەکات و لە گەڵ عەسری مەعریفیشدا دەگونجێت و عەولەمەو جیهانگیری کۆڵی پێنادات، بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە گەشەی بەردەوامدایە، دەکرێت مرۆڤێکی عاقڵ وا بیربکاتەوە بڵێت ئەمە توانای کە سێکی نەخوێندەواری بێباوك لە ژینگەیەکی نەزان و خورافەدا دروستی کردبێت و لە زادەی عەقڵی ئەو تاقە کە سەدا بێت، هیچ کەس ناتوانێت وایبر بکاتەوە، تەنها بەوە دەبێت کە موحەممەد (ﷺ) دەفەرمووێت: "من بەتەنها بەشەرێکم ئەوەی دەیڵێم لە خواوە بۆم دێت و هیچی تر".

## منداڵێتی

***یەکەم:*** پ1، لا14، دێڕی (3–4) "لەبەرئەوەی کە وێڵو سەرگەردان نەبێتو یارمەتی مامیشی بدات حوشترەکانی (أبوتاليب) چەند کە سێکی تری دەبردە لەوەڕو تا ئێوارە..".

سەرەتای ئەم پەرەگرافە باسی هەژاریو نەداریی مامی حەزرەتو پاشان باسی حوشترەکانی مامی دەکات، بۆیە ئەمە پێچەوانەی یەکدیە، چونکە تەنها هۆکاری دەوڵەمەندبوون لەو ناوچەیەدا بازرگانی بووەو هەرکەس وشتری زۆری هەبووبێت دیارە زۆرترین خێری دەسدەکەوت، هەربۆیە مامی پێغەمبەر (ﷺ) وشتری زۆری نەبووە، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکە بە حوکمی شارەزاییم لە کاروباری گوندنشین، وڵاخی گەورەو بەرز شوانی ناوێت، چونکە لە شوێنێکدا ناسرەوێتو کۆنترۆڵ کردنیشی ئاسان نییەو گیانەوەری دڕەندەش زەفەری پێنابات.

ئەوەشی کە نووسەر باسی شوانیی حەزرەت دەکات بۆ وشترەکانی مامی زۆر دوورە لە واقیعەوە، لەبەرئەوەی لە هیچ سەرچاوەیەکدا باس لە شوانی وشتری تێدا نییە، دیارە نووسەر وەك حیکایەت بیستوویەتیو خوا دەزانێ لە چ پڕوپیرەژنێکی بیستووە، ئەگەرنا بۆ سەرچاوەکەی باس ناکات، ئەوەشی لە سەرچاوەکانی سیرەدا هاتووە ئەوەیە، حەزرەت بۆ هاوکاری مامی شوانیی کردووەو مەڕی لە وەڕاندووە، لە پای ئەو کارەدا کرێیەکی وەرگرتووە، بەمە هاوکاری مامی کردووە.

ئەوەتا لە فەرموودەیەکی ڕاستو دروستدا دەفەرمووێت "خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت دەبێت شوانیی مەڕی کردبێت، هاوەڵەکانی فەرموویان: تۆش ئەی پێغەمبەر(ﷺ)؟ فەرمووی، بەڵی، شوانی مەڕ بووم بۆ خەڵکی مەککە بەچەند درهەمێك" یان بەشێك لە دیناری ئەوکاتە.

ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری بە ژمارە (2262)و ئیبن ماجە بە ژمارە (2149) ڕیوایەتیان کردووە.

***دووەم:*** پ2، لا14، دێڕی (1–3) "منداڵێکی زیرەكو هەستیار کە چەند ساڵێکە بەمشێوەیە ڕۆژگار بەسەر دەبات، ڕەنج دەکێشێتو بەبەردەوامی وەك بنێشتی تاڵ دەیجوێت، بۆچی بە هەتیوویو بێباوك لەدایکبوو؟ بۆچی کە دایکە گەنجەکەی ..."

لە پ3، لا14دا "لەناو بێدەنگیو تەنهایی ئەو بیابانە بەدفەڕەدا کە وشترەکان هێزیان دەدەنە خۆیان، تا بتوانن لە کڵۆ بەردییەکان دڕكو ئالیکیان چنگ بکەوێت، جا لەم ساتەوەختەی بە تاڵیو بێتاقەتیدا، جگە لە بیرکردنەوەو بێزاریی بۆ پەروەردەکردنی مێشکی دەتوانێت چی بکات؟".

ئەوەی ئەم پەرتووکە بخوێنێتەوە تووشی شۆك دەبێت بەو هەموو پێچەوانەو دژ بەیەکانەی نووسەر تۆماری کردوون، لە پ1، لا14 دەنووسێت" لە بارەی سەردەمی منداڵیی زانیارییەکی وا لە بەردەستدا نییە"، لەلایەکی دیکە باسی وردەکارییەکانی ژیانی حەزرەت دەکات کە چۆن شوان بووە چۆن بیری کردووەتەوە چۆن ژیاوە، ئەوەی نووسەر ئاماژەی پێدەکات وا تێدەگەم ئەم نووسەرە سیناریۆی نووسێکی بەهێز بێت، چونکە لە ناخی خۆیدا خۆی دەخاتە شوێن منداڵێکی هەتیوو، مەنەلۆجێکی داخلی دەست پێدەکاتو سەرەتا بابەتێك دیاری دەکات تا بە سەرنجامێك بگات، بەڵام بەسەقەتی، هەربۆیە دەڵێم: ئەگەر کە سێك تەنهاو بەناچاری شوانیی دەست کە وتبێت لە بەردەست مامێکی هەژارو کەم دەرامەتو لە ژینگەیەکی زۆر دواکەوتوو کە نەخوێندەواری بەسەریدا زاڵ بێت، ژینگەیەك کە تا ئەوکاتە شمشێر سەنگی مەحەکی یەکلاکردنەوەی هەموو کێشەکانیانە، منداڵێك ژیانی بە قسەی نووسەر لەگەڵ ئەو ژینگە بەسەر بەرێت لە عەقڵی کێدایە لە باتی ئەوەی بیر لە خۆشگوزەرانی بکاتەوە، بیر لە پەروەردەی مێشکی بکات، خۆ نووسەر چاك دەزانێت مەگەر

خۆی گێل بکات، کاتێك حەزرەت شوانیی کردووە تەمەنی لە نێوان (8-14) ساڵان بووە، چونکە لە (14) ساڵیدا لە جەنگی فوجاردا بەشداریی دەکات، هەربۆیە نووسەر لێی تێکچووە لەمەشدا، چونکە بە وتەی خۆی لە ژیانی منداڵیەوە تا تەمەنی (40) ساڵی هیچ جۆرە دەرکەوتەیەکی زیرەکی لێ بەدی نەدەکرا، ئەی بۆچی لێرەدا پەشیمان بووەتەوە؟، لەلایەکی دیکە نووسەر چۆن زانی کە حەزرەت وایبری کردووەتەوە؟، ئایا ئەمە پیشەی هەموو هەتیوێکە، یان هەموو شوانەکان بەپەروەردەکردنی مێشکیانەوە خەریك دەبن؟ یان تەنها دروستکردنی چیرۆکێکی ئەفسانەیی دوور لە واقیعە، کە وادەکات کتێبەکە لە رووی زانستییەوە هیچ بەهایەکی نەبێت؟!.

***سێیەم:*** پ4، لا15، دێری (1-4) "بەو هۆشە تیژو هەستیارە توندەی دەمارەکانیو ئەندێشە روونەیەوە (محمد)ی تەمەن یازدە، تا دوازدە ساڵە لە خۆی دەپرسێت "ئایا لەم بەردە رەشەدا هێزێکی نهێنی هەیە؟، ئایا ئەم پەیکەرە بێ هەستو بێجوڵەیە کارێکی لێدەوەشێتەوە؟)".

لە وەڵامی ئەم پەرەگرافەدا تەنها ئەوە دەپرسم لە چ سەرچاوەیەكو چۆن زانی، لە کاتێکدا لە پ4، لا3، دێری (1-4) "هەر لە تەمەنی منداڵیەوە تا ساڵی 610ی زاینی، واتە تا ئەوکاتەی کە تەمەنی گەیشتووتە چل ساڵی، هیچ بەرهەمو شوێنەوارێکی گرنگ لە مێژووی ئەم منداڵەدا نییە تەنانەت لە ژیاننامەو سەرگوزشتەکانی ئەو سەردەمەشدا بەڵگەیەکی روونو نائاساییمان بەرچاو ناکەوێت".

لەگەڵ ئەوەی هەمووان دەزانن و هەست دەکەن لەم رۆژگارەی خۆماندا بەبوونی ئەو هەموو سەرچاوە مەعریفیانەی لە رادیۆو تەلەفزیۆنو گۆڤارو قوتابخانەکان چ منداڵێك لە تەمەنی (11-12) ساڵیدا بیر لەوە دەکاتەوە کە پەرستن و پەرستراوان چۆنن و لە چییەوە هاتوون؟ چ جای ئەو سەردەمەی حەزرەت.

لە پ2، لا7، دێری (2)دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە سەفەری حەزرەت بۆ شام لە کاتێکدا تەمەنی (12) ساڵان بوو دەڵێت "لەوانەیە تەمەنی ئەو (واتە حەزرەت) وەڵامدانەوەی کارێکی بەمجۆرە نەبووبێت:

لەگەڵ ئەوەشدا پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی کاریکردۆتە سەر رۆحی هەستیار رەنج چێشتووی.

***چوارەم:*** پ5، لا15، دێری (1) "ئایا ئایەتی (والرجز فاهجر) واتە لە خراپە دوور بکەوەرەوە".

ئەم پەرەگرافە درێژەی باسی پەرەگرافی پێش خۆیەتی کە باسمان لێوە کرد، بەڵام کە راڤەی ئایەتەکە دەکات باس لە دوورکەوتنەوە لە خراپە دەکات، لە کاتێکدا راڤەی ئایەتەکە بەم شێوەیەیە: عەلی کوری ئەبی تەڵحە لە ئیبن عەباسەوە دەگێرنەوە کە (الرجز) واتە بتەکان، واتە واز بهێنە لە بتەکان، هەروەها موجاهید و عەکرەمەو قەتادەو زوهریو ئیبن زەید بەهەمانشێوە دەڵێن کە بە واتای بتەکان دێت، بەڵام ئیبراهیمو ضحاك وشەی (الرجز) بەتاوانو خراپە راڤە دەکەن.

کە نووسەر رای دووەمی هەڵبژاردووە، کە دەبوایە لەگەڵ رای یەکەمدا بوایە، لە بەر باسەکەی خۆیو زۆری کە سەکانی رای یەکەم.

***پێنجەم:*** پ5، لا15، دێری (3) "هەروەها ئایەتی (ووجدك ضالا فهدى) خودا تۆی گومراکرد، پاشان هیدایەتی کردی، سورەتی الضحى ئایەتی (7)".

کێشەی وەرگێران لەوەوە سەردەگرێت کە زمانێکیان لەوی تریان تاکی وشەکانی زۆربێت، لەوی تریان ئەوەش بەهۆی زۆری زاراوەکانی، یان دابرانی ناوچەکانی، هەربۆیە تەفسیری ئەم ئایەتە بۆ فارسیو پاشانیش بۆ کوردیی کارێکی دژواری دروست کردووە، لەبەرئەوەی وەرگێرەکەشمان شارەزایی نییە لە زمانی عەرەبیداو تێکەوتووە، وشەکانی بەسەقەتی وەرگێراوە، بۆیە (ضال) لە زمانی عەرەبیدا بەواتای ونبوو، یان بێئاگا، نەزانینو کۆمەڵێ واتای تردێت، ئەوەی جێگەی سەرنجە لێرەداو لە تەفسیرەکانی قورئاندا هاتووە مەبەست پێی بێئاگایی پێغەمبەر لە وەی کە چی چاوەرێی دەکات، یان ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆ بێئاگا بوویتو خودا رێنومایی کردی، نەك بە واتا گومرا کە لە عەرەبیدا بە (غوی) هاتووە، بەڵام لە بەرکلۆڵی وەرگێر بەو شێوەیە راڤەی کردووە.

***شەشەم:*** پ2، لا16، دێری (1) "لەناو یێدەنگی بێپایانی بیابانو لە تەنیایی ترسناکی ئەو رۆژانەدا کە وشترەکان خەریکی پەیداکردنی درِكو داڵی مەمرەو مەژی بوونو ... لە رۆحی محمددا هەراو هوریایەك بەرپادەبوو...".

لەماوەی ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە حەزرەت شوانی مەڕ بووەو هیچ سەرچاوەیەك باسی لە شوانی وشتر ناکات، کە واتە عەرەب دەڵێت "ما بني على باطل فهو باطل"، ئەوەی لەسەر درۆ دابمەزرێت دەبێتە درۆ، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکە دەڵێی نووسەر هەتیو بووەو شوانی وشتریش بووە، بەڵام نازانم، لە ئێراندا شتی وا هەبێت یان نا، چونکە خۆی بۆ خۆی مەنەلۆج دەنووسێتو دەروونەکان شی دەکاتەوە لەسەر چ بنەمایەك، هەربۆیە وا دەردەکەوێت نووسەر نەخۆشییەکی دەروونی هەبێت، بەڵام لەسەری ئیسلامدا دەیشکێنێتەوەو هیچی تر، تەنها پاساوێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە گریمان مەزەندەیە، وەك نووسەر خۆی باسی دەکات لە پ3، لا17، دێڕی (6)دا.

***حەوتەم:*** پ4، لا16، دێڕی (1) "لە تەمەنی (11) ساڵیدا لەگەڵ (أبو تاليب) چوو بۆ شام... لە شامدا لەگەڵ خەڵکانێکی تێگەیشتوو ژینگەیەکی باشترو داب‌و نەریتی چاکتر بەرەوڕوو بوویەوە، کە دیارە کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر ئەم داناوە..." لە پ2، لا17 "بەتەواوی ڕوون نییە کە لەم سەفەرەدا بۆ شام لەگەڵ ئەهلی ئاینە تەوحیدییەکانی تر پەیوەندی گرتووە، یان نا، لەوانەیە تەمەنی ئەو وەڵامدەرەوەی کارێکی بەم جۆرە نەبووبێت...".

ئەم دوو پەرەگرافە ڕاستە لە دوو لاپەڕەی جیاوازدا دێن، بەڵام لەدوای یەك دێن، بەڵام دوو پەرەگرافی مانا جودا، کە دووەم دژی یەکەمەو خوێنەر دووچاری ئەوە دێت ئەگەر زانیاریشی نەبێت لە بارەی مێژووەوە تێدەگات سەرچاوەی ئەم کتێبە خەیاڵاتو بیستنی قسەو قسەڵۆکە، ئەگەرنا نووسەر بۆ یەکلایی نەکردووەتەوە، کامیان ڕاستە؟، پاشان لە ڕوانگەی سەرچاوەکانی مێژوویی ئیسلامیی دێنە سەر تا لێدانی، سەبارەت بە تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کتێبی (البداية والنهاية، تاريخ الطبري، السيرة النبوية)م کرد، هیچیان باسی تەمەنی (11) ساڵەی حەزرەت ناکات، هەندێکیان باسی تەمەنی دەکەن دەڵێن (12) ساڵان بوو، ئەوەشی کە دەڵێت لەگەڵ خەڵکانێکی تێگەیشتووتر...، لە هیچ باسێکدا بەرچاوم نەکەوتووە، دەمێنێتەوە بڵێین ئەمە ڕق‌و کینەی پان ئێرانیزمی نووسەرە لە خەڵکی دوورگەی عەرەب، ئەگەرنا ئەوانیش هەر عەرەب بوون لە شامدا، تەنها ئەوەندە هەیە لە ژێر ڕکێفی ڕۆمدا بوون، بۆیە بەبڕوای نووسەر لە عەرەبی جەزیرە باشترن‌و هیچ سەرچاوەیەك ئاماژەی بەڕای نووسەر نەکردووە.

سەبارەت بە پەرەگرافی دوای ئەو، ئەوە چەسپاوە لەم سەفەرەدا بۆ شام (بحيرى) کە پیاوێکی ئاینی مەسیحییەکانە چاوی کەوتووە بە حەزرەت، کۆمەڵێ نیشانەی لێبینیوەو بە مامی وتووەو کە ئەم گەنجە لەگەڵ خۆت مەبە، نەوەك جولەکە بیناسنەوەو دووچاری کێشەیەکی بکەن.

ئەوەشی کە دەڵێت لەگەڵ ئەهلی ئاینە تەوحیدیەکانی‌تر تەنها قسەیە، یەکێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بە ڕیوایەتێکی واقیدی دەکات کە لەم سەفەرەشدا هەندێ کەسی وەك (زريرو تەمام‌و دريس)ی یەهودی چاویان بە حەزرەت کەوتووە. کە ئەم فەرموودەیە لە ڕووی زانستی فەرموودەناسییەوە لاوازەو وەرناگیرێت، چونکە واقیدی پیاوێکی فەرموودە لاوازە .

لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتاوە باسی ئەوەی دەکرد بەهۆی بوونی جولەکە لە مەدینە کە بووبوویە فاکتەرێك بۆ پێشکەوتنی مەدینە لە (مەککە) کە ئەم کێشانە دەبوایە ڕاست بوایە بۆ پێشکەوتنی ناوچەکە لە ناوچەی شام لە بەربوونی ڕێژەیەکی زۆری جولەکە لە ناوچەی جەزیرەدا بەتایبەت مەدینە، چونکە هەمیشە جولەکە سەلماندویانە لە خەڵکی دیکە بەتایبەت ڕۆمەکان زیرەکتر بوون، بەڵام بێهێزتر بوون.

***هەشتەم:*** پ2، لا17، دێڕی (5–7) "بەپێی هەواڵە جیاجیاکان لە سەفەری دواتر بەم جۆرە نەبووەو بەهۆی بیری تینوانەو هەڵسەنگێنەرانەیەوە شتی زۆر لە ڕێبەران‌و پێشەوایانی ئایینەکانی تر فێربووەو کەڵکی لێوەرگرتوون" .

ئەوەی سەرنج بدات لەم پەرەگرافە وا دەزانێت حەزرەت هەمیشە بەرێی شامەوە بووە، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە، دەکرێت بڵێین چەند سەفەرێکی کردووە لە کاتی بازرگانیدا، بەتایبەت بۆ خەدیجەی کچی خوەیلد، بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەك ئاماژە بەبینینی ڕابەران‌و پیاوە ئاینییەکان ناکات، دەکرێت بڵێین تەنها دەزگای سیخوڕی نووسەر نەبێت بە بەڵگەیەکی نهێنی ئەویان لە لای یەکێك لەو پیاوانە بینییەوەو هیچی تر.

***نۆیەم:*** پ3، لا17، دێڕی (5–6) " ئەوەشی کە ئێمە دەینووسین لە گریمان‌و مەزەنەیەك بەولاوە زیاتر نییە" .

دەکرا سەرەتای هەموو پەرەگرافەکان ئەم برگەیە دووبارەو چەندبارە بکەینەوە بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت کە ئەم نووسراوە تاچەند زانستییە، لە لایەکی دیکە ئەگەر هەموو تەحلیلەکانی نووسەر لە سەر ئەم بنچینەیە بێت، بۆ دەبێت تەسلیم بین بە نووسەر، کە درۆی لە ڕاستی چەند قاتەو ئەوە ئاستی زانستیەتی!!.

## پەیام (الرسالة)

***یەکەم:*** پ3، ل22، دێڕی (1–6) "بەشێکی زۆر لە زانایانی خاوەن بیرو ڕووناکبیری وەك محمدی کوڕی زەکەریای ڕازیو أبو العلاء معري نکوڵی لە ئەسڵی پێغەمبەرایەتی دەکەنو.."

لە یەکێك لە بڕگەکاندا باسم کرد نووسەر وا دەزانێت ئەو شتانەی دەینووسێت پەسندنو ئیتر کەسیتر ئاگای لە باسو خواسی دنیا نییە، باسی ئەوەشمان کرد ناو دەهێنێت بەبێئەوەی ڕوونی بکاتەوە کێیەو، زانا باس دەکات بەبێئەوەی پەیوەندیی بە باسەکەیەوە هەبێت، ئەوەتا باسی موحەممەدی کوڕی زەکەریای ڕازی دەکات، ڕوونی ناکاتەوە کە بەهەمان ناو ڕاڤەکەرێکی قورئان هەیە، بۆ ئەوەی خوێنەر لێی تێکبچێت، چونکە موحەممەدی ڕازی یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی سەردەمی ڕێسنانسی ئیسلامیی کە تێیدا سەرجەم بەرهەمەکانی یۆنانو هندو فارسو گەل و نەتەوەکانی دیکە دەگۆڕایە سەر زمانی عەرەبی، ئەویش یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە تا ئەندازەیەك سەرخۆش بووە بە فەلسەفەی یۆنانیو وەك قسە لێی دەگێڕنەوە کە باسی لە بوونی پێغەمبەرایەتی دەکاتەوە، ئەگەرنا کە سێکی مسوڵمان بووە تۆزو بوخاری کوفرو بێباوەڕی لێ بەدی نەکراوە، سەبارەت بە (أبو علای معری) یەکێکە لە و فەیلەسوفانەی کە لە دوو بواری زمانو ئەدەبدا زۆر شارەزابووەو سێ بەرهەمی پێشکەش کردووە بەدونیای ئەدەب و فەرهەنگ کە (اللزوميات، سقط الزند، رسالة الغفران)نو بڕوای تەواوی بە ئیسلام هەبووە لە خوداو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی ئەوەتا لە دێڕێك شیعردا کە موناقەشە دەکات لە سەر زیندووبوونەوە دەڵێت:

زعم المنجم والطبيب كلاهما لن تحشر الاجساء قلت: اليكما

ان صح قولكما فلست بخاسر أو صح قولي قالو بال عليكما

کە ئاشکرایە بڕوای بەڕۆژیو دواییو زیندووبوونەوە هەبووە، ئەوەش یەکێك بووە لە بڕواکانی، هەروەها زۆر بە ئاشکرا لە کتێبی (رسالة الغفران) باسی پێغەمبەرایەتی دەکاتو باسی شەفاعەتی حەزرەتی موحەممەد دەکاتو باسی پێغەمبەر دەکات. جا نازانم نووسەر لە کوێوە هێناویەتی کە مەعري بڕوای بە پێغەمبەرایەتی نەبوو، پاشانیش کە دەڵێت زانای زۆر، کامانەن جگە لەم دوانەی کە باسی لێوە کردووە، ئەوەیش بەو شێوەیە نییە کە نووسەر باسی دەکات.

***دووەم:*** پ2، ل23، دێڕی (1ـ3) "ئایا ناردنی پێغەمبەر بۆ ئەوەیە کە ئەم سرووشتانە بگۆڕێت؟، مەگەر بە ئامۆژگاریو قسەکردن دەکرێت ڕەش پێستێك بکرێت بە سپی تاکو بتوانرێت سرووشتی شەڕخواز بکرێت بە سرووشتی خێرخواز؟"

بەبڕوای نووسەر مرۆڤ هەرچی کرد پرسینەوەی نییە، چ وەك دنیا، یان وەك دینداران بڕوایان پێیەتی لە دواڕۆژدا، چونکە سرووشتی ئینسانی شەڕانی بەدەست خۆی نییەو شەڕانی بوون وەك ڕەش پێست بوون وایە، بۆیە ناکرێت هەوڵ بدرێت بۆ چاککردنو ڕێگەگرتن لە خراپە، بەهەڵەداچوونی ئەم نووسەرە لەوەدایە کە نازانێت ناشزانێ بۆ نازانێت، چونکە ئەگەر بیزانییایە دەیپرسیو فێردەبوو، خوشیو خوێنەرانیشی تووشی سەرئێشە نەدەکرد، دەبێت ئەوە بڵێین سیفەتەکانی ئینسان دوو جۆرن، سیفەتی موکتەسەبو سیفەتی خۆیەتی (جبلی) واتە لەگەڵ دروستبوونیدا پێوەی لکاوە. لەو سیفاتەی کە موکتەسەبن، واتە بەدەستهاتوون شەڕەنگێزی، شپرزی، لە سەرخۆیو ڕێكو پێکی کە دەکرێت ئینسان لە سەردەمێکدا بەهۆی بارودۆخێکەوە شەڕەنگێز بێتو لە بارودۆخێکدا لەسەرخۆ بێت، دەکرێت هەندێ کات شپرز بێتو هەندێ کاتی دیکە ڕێکوپێكو قەشەنگ بێت، ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم سیفەتە موکتەسەبانە پەیوەندییەکی تەواویان بە ژینگەو پەروەردەو کاتو ساغو سەلامەتیو بداریو نەداریو ...هتد هەیە، بۆ نموونە، ئەو

ڕەش پێستەی لە دارستانە چڕو پڕەکانی ئەمەزۆندا دەژی، هەرئەو ڕەشپێستە لە دەوڵەتێکی وەك هندستاندا دەژی کە کۆنترین‌و باڵاترین سیستمی دیموکراسی تێدا پیادە دەکرێت، ئەو سپی پێستەی لە سرب دەژی، ئەو سپی پێستەی لە بەریتانیا دەژی کە یەکەم چەند شەڕەنگێزەو دووەم چەند خەڵکێکی شارستانییە، ئەگەر ژینگەیەکی گونجاوو بە یاسا پەرژینکراوی بۆ دانەمەزرێت مرۆڤ بە سروشتی خۆی سەرکەشە، بۆیە ژینگەی دروست وای کردووە کە ئینسانەکانی ئەورووپا مرۆڤدۆست بوون لەم سەردەمەداو ژینگەیەکی شەڕخوازیان بویٚ لە سەردەمانی پێش ترداو داگیرکەرو خوێنخۆری میللەتانی‌تر بوون، چی وای لە ئینسانەکانی دنیا کرد لە وپەڕی هەمەجی‌و بەربەرییەوە بگەنە ئەوپەڕی دیموکراسی‌و ئازادی‌و مافی مرۆڤ؟، چی وای کرد لە گەلی ئەمریکی کە ڕاوی سوور پێستەکان بکات‌و ئێستا دیموکراسیەت دەبەخشنەوە بەوڵاتاندا؟، خۆ ئەگەر سرووشتی ئینسان شەڕانی‌و شەڕخوازی بێت لە دەسەڵاتی خۆیدا نەبێت بۆ دەبێت یاسای بۆ دانێن‌و تەمیەی بکەن؟، بۆ دەبێت پەیمانگای پەروەدەکردن پەرە پێبدەن؟، ئەی کەواتە ئەو هەموو بەرنامانەی کە لە سەرانسەری جیهاندا هەن لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان‌و گۆڤارو ڕۆژنامەو پەرتووك، ئەکادیمیایی زانستیی‌و پەروەردەیی کاریان چییە ئەگەر بۆ گۆڕینی سلوکی کەسەکان نەبن؟، هەربۆیە مرۆڤێکی ئاسایی بهێنە کە لە سەر خۆبێت ستەمێکی لێبکە، کاردانەوەی‌خراپی بۆ دروست دەبێت‌و لە مرۆڤێکی لەسەرخۆوە دەگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی شەڕەنگێزو دوژمنگەرایی، کەواتە مرۆڤ خۆی لە خۆیدا قابیل بە گۆڕانەو هەردوو لایەنی چاکەخوازو شەڕەنگێزی تێدا دروست دەبێت، مرۆڤ حەزی هەیە، کەواتە پەروەردەو ژینگەو بوون و نەبوون و ئیسراحەت‌و ساغ‌و سەلامەتیی دەتوانێت حەزەکانی بەلایەنی پاك‌و خاوێن‌و ڕێکوپێکیدا گەشە بکات‌و پەروەردەی سەقەت‌و ژینگەی دواکەوتوو نەبوونی ئیسراحەت‌و نەخۆشی دەتوانێت لایەنی شەڕی تێدا نەشونما بکات، کەواتە نووسەر زۆر بەهەڵەدا چووە کە مرۆڤ بە ئالەتێکی بەردئاسا تەماشا دەکات، هەرچۆن بێت ناگۆڕێت، بەڵکو مرۆڤ بوونێکی گۆڕاوە، سەرجەم کارتێکەرەکانی دەروونیی‌و ژینگەیی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی‌و ئابووریی‌و....هتد، کاری تێدەکات، وەڵامدانەوەی باش‌و گونجاوی بۆیان دەبێت، هەر ئەمەشە بووەتە هۆی ئەوەی حەزرەت توانیویەتی لەسەر ژینگەیەکی دواکەوتوو کەسانێکی شەڕخواز بکاتە نموونەو سیستەم‌و یاسایەك بۆتە هۆی سنوور بۆ دروستکردنی سلووکی تاکەکان کە لە دیدەو سلوکی دەوڵەت پێکهاتووە، وەك نووسەر ئاماژە دەکات لە پ1، لا13دا دەڵێت "خولقێنەرترین بوونەوەری مێژووی بەشەریەت دابنرێت" لە بەرامبەردا کۆمەڵێك سیفات هەن کە ڕاستە لە دەستی خودی ئینسانەکەدا نییە، بەڵام پەیوەندیی بە ڕەچەڵەکی ئینسانەوە هەیە. بۆ دەبێت ئینسانەکان بە بەرپرس بزانین لە وەی چۆن دەکەونەیەك؟، چۆن نەوە زیاد دەکەن؟، ئەوەش لە زانستی سەردەمدا بە ئاشکرایی‌و بێ پێچ‌و پەنا دەرکەوتووە کە سیفاتە بۆماوەییەکان دەگوێزرێنەوەو وەچەکەکانیان لە ڕێگەی بیردۆزەی (مەندل)ەوە دەزانرێت ڕەنگی چاوو پێست‌و باڵاو زیرەکی‌و ...هتد دەستی بەسەردا بگیرێت، بۆ نموونەش باسی دەکەین کە لە ئایینی ئێمەدا باش نییە مرۆڤەکان لەگەڵ خزمە نزیکەکانیاندا هاوسەریی بگرن، بۆ ئەوەی بۆ ماوەکانی لە کەسەنزیکەکاندا بۆ ماوەیی زاڵن ڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە، چونکە ئێستا کۆپی کردنی ئینسان و ئەندازەی بۆماوەیی زۆر شتی نهێنیان پەی پێبردووە کە نووسەر نەبیستوویەتی، نە زانیویێتی‌و نە هەوڵیشیداوە بیانزانێ. ئەگەرنا بەو شێوەیە تێنەدەکەوت.

لە کۆتاییدا ئەوە دەڵێم کە قوتابخانەو بوونی شوێنی بێ‌نەوایان‌و زیندانەکان پێویستە شوێنێك بن ئینسانی تێدا بونیاد بنرێت، وەك خەڵکی بەو شێوەی دروستکردووە، نەك شوێنی رووخانی ئینسانەکان بن لە بەها جوانەکانی ئینسانییەت.

***سێیەم:*** پ4، لا24، دێڕی (1-5) "کەواتە حەقیقەت ئەوەیە کە ناردنی پێغەمبەران ئاکامێکی نەبووەو زانایانی ئەهلی دین بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی بەبێ هودە خۆیان ماندوو دەکەن، سەلماندنی پێغەمبەرایەتی کە زانایانی مەزهەبی‌و ئایینی، چ لە دنیای ئیسلامداو چ لە ئاینەکانی تردا شێلگیرانە هەوڵیان بۆداوە جێگای گومانەو لەگەڵ مەنتیقی عەقڵدا ناگونجێت".

سەرەتای بەرپەرچدانەوەی ئەم پەرەگرافە بە وتەیەکی برنادشۆ دەست پێدەکەم کە دەڵێت "ئەگەر موحەممەد لە زیاندا بوایە لە ماوەی خواردنەوەی کوپێ قاوەدا کێشەکانی دنیای ئەمڕۆی چارەسەر دەکرد"، ئەگەر سەرنجێك بدەینە پێشینەی ئەو گەلانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتووە، لەپێشدا لەچ ئازارو ستەمو زوڵمێکدا ژیاون، ئەوەتا ڕەبیعی کوڕی عامر کە دەڕوات بۆ لای پاشای فارسەکان پێی دەڵێت: "ئێوە بۆچی هاتوون؟، دەڵێت "خوای گەورە ئێمەی نارد تا بەندەکان لە بەندایەتی ئینسانەکان دەربهێنن" کەواتە ئەوەی دەکرا لە جزیرەی عەرەبی و چواردەوریدا مرۆڤپەرستیی بوو، ئینسانەکان بووبوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان بەندەو نۆکەرو هەندێکی کەمی نەبیلو سەید، لە ناو ڕۆمدا بەهەمان شێوە بووبوونە دوو چین و هەروەها لە مێژوودا باسی دەکرێت کە جیهان پێش هاتنی ئیسلامو هەر دینێکی دیکە لە چ ئاڵۆزیەکدا بوو، ئەوەتا جولەکەکان لە ژێر ستەمی فیرعەونەکاندا بوون، تا خوای گەورە موسا پێغەمبەر (علیە السلام)ی بۆ ناردنو ڕزگاری کردن، هەروەها عیساو ئیبراهیمو ...هتد، سەرجەم لە مێژوویەکدا هاتوون کە گەلەکانیان لە چەوساندنەوە ڕزگار کردووە، بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایە کە ئەوانەی ئێمە پێیان دەڵێین پێغەمبەران توانیویانە جیهان بگۆڕن لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکیو لە ستەمەوە بۆ دادپەروەری، لە نەزانییو نەفامییەوە بۆ زانستو زانیاری، لە کۆیلەیەتیو بەندایەتی ئینسانەکان بۆ ئازادیی خواپەرستی، ئەوەش بیری نووسەر دەخەمەوە کە دەڵێت لە پ4، لا10 دێڕی (1) "گومان لە وەدا نییە کە محمد یەکێکە لە بەرچاوترین بلیمەتەکانی مێژووی سیاسیو گۆڕانکارییە کۆمەلایەتییەکان، ئەگەر بارودۆخی کۆمەلایەتی لە بەرچاو بگرین، هیچکام لە مێژووسازانو خولقێنەرانی ڕووداوی گەورە وەك ئەو نابن، نە ئەسکەندەرو قەیسەر، نە ناپلیۆنو هیتلەر، نە کورشی مەزنو جەنگیز، نە ئەتیلاو ئەمیر تەیموری گورکان، هیچیان وەکو ئەویان تیا نابێت" یان لە پ1، لا(13)، دێڕی (2) "ناتوانم کە سایەتیو بەتوانایی هێزی ڕۆحی مرۆڤێك داڕێژم کە دەبێت وەك (لینین) بە خولقێنەرترین بونەوەری مێژووی بەشەریەت دابنرێت".

پ2، لا26، دێڕی (5) "ئاین هەر هەبووەو هەیە، ئەم بیروباوەڕە لە ناو میللەتە دواکەوتووەکاندا ئالودە بەترسو خورافەیەو لە ناو میللەتە پێشکەوتووەکاندا لە ژێر کاریگەری بیری زانایانو خاوەن بیرەکانی ئاییندا، بۆتە ئامۆژگارییەکی ئەخلاقیو ڕێکخەرێکی کۆمەڵایەتی کە ئەوانی لە حاڵەتی وەحشیگەرییەوە دەرهێناوەو بەرەو پێکهێنانی سیستمو عەدالەتو ئاسایشی ژیان ڕێنمایی کردوون".

ئەی کەواتە حەقیقەت ئەوەیە ناردنی پێغەمبەران ئەوەی لێکەوتووەتەوە کە نووسەر شاهیدی لەسەر دەدات، ئەوەشی کە نووسەر دەڵێت "لەگەڵ مەنتیقی عەقڵدا ناگونجێت"، ئەوەیە کە دەڵێم دوو جۆر عەقڵ هەیە، عەقڵی دروستو مەنتیقیو عەقڵی دۆگماو خەیاڵاوی، سەلماندنی بوونو پێویستیی پێغەمبەرایەتی، هەم وەك مێژوویەك کە لە کاتی خۆیدا بە سەدان هەزاران کەس چاویان پێیان کەوتووەو بڕوایان پێهێناون، هەم ئەوانەی عەقڵی ڕاستو دروستیان هەیە بە مەنتیقی عەقڵ بڕوا دەهێنن، ئەگەرنا بۆ ئەو عەقڵانەی کە دۆگمان کارێکی نامەنتیقیو نا عادیلانەیە، بەم نموونە سادەیە دەپرسم، ئەگەر بۆ پەروەردەکردنی کۆمەڵە خوێندکارێك پێویست بێت نوێنەری دەزگای پەروەردەیی وجودی هەبێت، ئایا پەروەردەکردنی هەموو بەشەریەت نابێت نوێنەرێکی ڕاستگۆی هەبێت لە لایەن پەروەردگارەوە؟.

***چوارەم:*** پ(1-2-3-4)، لا25 سەبارەت بە بوونی خوایە، کە نووسەر لە سەرەتادا گومان دروست دەکات لەسەر بوونی خوداو پشتبەستن بەوەی کە دروستبوونی جیهان ڕووداو نییەو پاشان ڕێگەیەکی ئاسان دەگرێتەبەر، چونکە بەگژ حەقیقەتێکدا چۆتەوە کە هەر کەسیتر وای کردووە گلاوە لە لینینی مامۆستایەوە، ئەوانەی کە ئێستا ئیدیعای شیوعیەت دەکەن ئەوەیان لا ڕوون بووەتەوە کە جیهان بەبێ بەدیهێنەر نابێت.

پاشان مەسەلەکە بە دژوار دەبینێت پێشنیاری چاوپۆشینی لێدەکاتو بیر لەوە دەکاتەوە کە هۆکارەکانی دروست بوونی چۆنن، تا ئەگاتە ئەوەی کە ئەو مەسەلانە ناکرێت لە ڕووی بەڵگەو مەنتیقی عەقڵەوە چارەسەر بکرێن، چونکە بە وتەی نووسەر سەلماندنی وجودی خودا، یان ڕەتکردنەوەی تەنها بەهێناوەی بەڵگەی عەقڵانی ڕووت کارێکی دژوارەو بگرە تا ڕادەیەك مەحاڵیشە، ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە هەموو چەکێکی ئەم نووسەرە عەقڵو مەنتیقی عەقڵ بووە، ئێستا پشتی پێنابەستێت. کە بەڵگەی ئیفلاسی عەقڵیو مەنتیقی نووسەر دەگەیەنێت.

***پێنجەم:*** پ2، لا26 دێڕی (3–5) "لەسەرەتاییترین‌و وەحشیترین تیرە ئینسانییەکانەوە بیگرە تا دەگاتە پێشکەوتووترین‌و چاکترین قەوم، ئایین هەر هەبووەو هەیە".

نووسەر ئینسان بە گشتیی دەکات بە دوو بەش، سەرەتایی‌و پێشکەوتوو، ڕاشیدەگەیەنێت لە نێوان ئەم دوانەشدا ئاین هەبووەو هەیە، ئاخۆ جەنابی نووسەر لە کام دەستەیە سادەترینە، یان پێشکەوتووترینیانە، لە سەر ئەم بابەتە چیرۆکێکم بەبیر دێتەوە لەبارەی موخابەراتی میسرەوە کە دەڵێت: ڕۆژێك جەمال عەبدولناسر دەیەوێت کۆمەڵێك دیاریی بکات کە گونجاوبن بۆ دەزگای هەواڵگریی وڵاتەکەی، کاتێك لە نێوان ئەو خەڵکانەی کە ئامادەبوون پرسیاری کرد کێ خوێندەواری هەیە بڕواتە لای ڕاست‌و پاشان وتی کێ نەخوێندەوارە بچێتە لای چەپ، کە سەیری کرد هەندێك ماونەتەوە نەچوونەتە لای ڕاست‌و لای چەپ، ئەوانەی هەموو دەستنیشان کرد بۆ پیاوانی جاسوس‌و کاری موخابەراتی پێسپاردن، وا دیارە ئەگەر سادەو ڕۆشنبیر جیابکرێتەوە بۆلای ڕاست‌و چەپ، ئەوا نووسەر لە نێوانیاندا دەوەستێت .

***شەشەم:*** پ2، لا28، دێڕی (2ـ 3) "لەسەفەرکردنەکانی بۆ شام تەنیا بە بازرگانییەوە نەوەستاوە، بەڵکو لەگەڵ ڕێبەران‌و کە شیشانی مەسیحیدا بەبەردەوامی پەیوەندیی هەبووە.." هەروەها لە دێڕی (5) "لەخودی مەککەدا لەگەڵ ئەهلی کتێبدا پەیوەندی هەبووە، ڕۆژانە چەندین سەعات لە دوکانی (جبر) دەمایەوەو لەگەڵ وەرەقەی کوڕی نەوفلدا کە ... پەیوەندیی بەردەوامی هەبوو".

ڕاستە مێژوو دووبارە دەبێتەوە، وامزانی تەنها سەفەری ئەمڕۆی مسوڵمان جێگەی گومانە، ئێستا تێگەیشتم کە سەفەری بازرگانیی حەزرەتیش بۆتە جێگەی گومان، خۆ زۆر بوون ئەوانەی سەفەریان کردووە بۆ شام، هەشبووە بەدوای ئاییندا گەڕاوە، یەکێکی وەك سەلمانی فارسی هەموو ژیانی لە ئەسفەهانەوە بە دوای ئاییندا گەشتووەتە عاموریەو پاشان مەدینە لە لای هەر ڕاهیبێك ماوەیەك ماوەتەوە، بەڵام جێگەی گومان نییە خەڵکی خاوەن ئەندێشەو بیریش زۆرجار چوون بۆ شام.

پ3، لا19، دێڕی (1) "خۆ (ئومەیەی کوڕی ئەبی سەڵت) کە لە خەڵکی تائیف‌و لە عەشیرەتی (بەنی سەقیف)و هاودەمی حەزرەتەو یەکێك لە (حنیف)ە ناودارەکانە کە خەڵکی بۆ خواپەرستی‌و خوداناسی بانگهێشت دەکرد، ناوبراو زۆر دەچوو بۆ شام‌و لەگەڵ ڕێبەران‌و زانایانی یەهودی‌و مەسیحیدا وتوێژی دەکرد.." بۆ نەیتوانی ببێت بە پێغەمبەر لەگەڵ ئەوەی زیاتر شارەزای کتێب‌و مێژوی میللەتان بووە، جگە لەوەش زمانی ئارامی‌و عیبریشی زانیوە، بەڵام گومانیان بۆ دروستنەکردوون، هەر کە حەزرەت باسی هاتنی وەحی کردو پێغەمبەرایەتی بەخەڵك ڕاگەیاند، خێرا بێباوەڕان لە پیشەی ئەوساو ئێستاش کەوتنە گومان دروستکردن، لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدا، ئەگەر حەزرەت ئەو شتانەی لە ڕێگەی بازرگانییەوە وەرگرتووە؟، چ مانیعێك هەبوو بۆ فێربوونی ئایینەکە بە مانگ بڕوات لەوێ بێت، ئەوانەی خەریکی بازرگانی دەبن زۆر چاك لەمە تێدەگەن کە کڕین‌و فرۆشتن دەبێتە سەرەتای خەم‌و کۆتا خەم، چونکە قازانج‌و سوود شتێکی خۆشەویستە لە هەمانکاتدا کاتێکی سنووردار لە قافڵەدایە کەس چاوەڕێی ئەوەی‌تر ناکات ئەگەر زۆری پێبچێت، تا ئێستا بەتەحەدداوە دەڵێین یەکێك لە بازرگانەکانی هاوڕێی حەزرەت باسی ئەوەی نەکردووە کە پەیوەندیی‌و ون بوونێك ڕوویدات کە حەزرەت بۆ ماوەی ئەوەندە کات لەگەڵ فلان پیاوی ئایینیی دابنیشێت، تەنها ئەوانەی لە دوورەوە ڕقیان لەم ئاینە بووەو هەیە، گومانی وایان هەیە.

ئەوەشی باسی ئەو گەنجە دەکەن بەناوی (جبر) دەکرێت بڵێین حەزرەت هەندێ شتی مێژوویی لێوە ئاگادار بووبێت، بەڵام بۆ جەبر نەی وت، یان نەیبیست کە بڵێت ئەوە بەرهەمی منەو مافی تۆی پێوە نییە، یان بە ئاشکرا ئاگاداری خەڵك بکات کە موحەممەد (ﷺ) دێت‌و من فێری دەکەم، لە کاتێکدا جەبر پیاوێکی نەسرانییەو عەرەبی نازانێت بەو شێوە بەلاغەیە [1].

[1] السيرة النبوية، ابن هشام، ج1، ص293.

قورئانیش بەسێ جار تەحەددا دەفەرمووێت: "کێ دەتوانێت سورەتێك، یان ئایەتێك، یان وەك ئەم قورئانە بهێنێت"، خۆ جەبر کەڵە شاعیری عەرەبیزانی زۆرو شارەزاو لێهاتووی بەتواناو خاوەن پارەو دەسەڵات هەبوون بۆ نەیانتوانی شتێکی وەك قورئان بنووسن و تەحەددای حەزرەتی پێبکەن؟[1] لە کۆتاییدا باسی وەرەقە دەکات گوایە پەیوەندی هەبووە، باسی ژیانی وەرەقەو باوەڕهێنانی وەرەقەمان کرد کە ئەمیان بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە کە دوژمنان جگە لە گومان توانای هیچی تریان نییەو وەرەقەش بە ئاشکراو بێپەردە دەفەرمووێت: "ئەمەی بۆ تۆ هاتووە هەروەك ئەوەیە بۆ موسا هاتووە"[2].

***حەوتەم:*** پ3، لا28، دێڕی (6ـ2) "داستانی هاتنە خوارەوەی وەحیو ئەو ڕیوایەتانەی کە لەسەر گوزشتەکانو فەرمودەکاندا هەیەو...ئینسانی خاوەن بیرو وردبین دەتوانێت لە ڕێگایانەوە پەی بە ڕاستییەکان بەرێت، هەروەها لەو ئامارو بەڵگەو نیشانانەی کە دەکرێت لە قورئانەوە بەدەستبهێنرێت، هەر هەموو ئەوە دەگەیەنو دەیسەلمێنن کە جموجوڵێکی نا ئیرادیانە لە ڕۆحی (محمد)دا پەیدابووەو ئەوی تەسلیم بە باوەڕێك کردووە کە سەرەنجام بۆتە خەیاڵاتو ڕووناکی ....".

خۆزگە دەمزانی ئینسای وردبین لە تێڕوانینی نووسەردا کێیە؟، تا بمانزانیایە کامانەن ئەو سەرگوزشتانەی کە دەتوانرێت لە ڕێگەیانەوە پەی بە ڕاستییەکان ببرێت، پاشان باس لە ئامارو بەڵگەو نیشانە دەکات، وەك ئەوە وایە باسی حکومەتی ئەلەکترۆنیی بکات، خۆ هەرنووسەر لە پ2، لا 3 دێڕی (4)دا دەڵێت "بەڵام هێشتا کتێبێکی ڕوونو مەنتیقی لەبارەیەوە نەنووسراو کە سیمای ئەو پیاوە دوور لە تەپو تۆزی مەبەست ..نیشان بدات" هەورەها لە پ3، لا17 دێڕی (6ـ5) "ئەوەشی کە ئێمە دەینووسین لە گریمانو مەزنەیەك بەولاوە زیاتر نییە".

ئەی ئینسانی وردبین لە کام ئامارو سەرگوزشتەی گریمانی چی کۆدەکاتەوە، جگە لە گریمانو سەرگوزشتەی گوماناوی.

***هەشتەم:*** پ1، لا29، دێڕی (5..) "باڵای مامناوەندیو گەنم ڕەنگو سورباو بوو، ... زۆر بەکەمی گاڵتەو گەپی دەکردو پێدەکەنی .... بەنیشانەو بەڵگەکاندا وا دەردەکەوێت کە لە زۆربەی مەراسیمو دابونەریتی قەومیی خۆیدا بەشداری کردووە، بەڵام خۆی لە هەموو کارێکی گەمژانەو بێکەڵکی لاوانی قوڕەیش بەدوور گرتووەو تەنانەت لە لایەن نەیارانیشیەوە بەکەسێکی دەستپاكو ئەمانەتدار ناوبراوە".

پێدەچێت نووسەر زۆر گەڕابێت تا ڕێی لەم هەموو سیفەتەی حەزرەت کە وتووە، گومانیشم نییە لەوەی بەناچاری نەقڵی کردوون، ئەگەرنا کەسێك کە سێکی خۆش نەوێت خەوی ناخۆشی پێوە دەبینێت، نووسەریش یەکێکە لەوانەی کە لە نەتاشراو قسەی تاشراو دروست دەکەن، بە تایبەت بۆ حەزرەت، لە کاتێکدا هەر هەڵگرانی بیروبۆچوونی نووسەرن ئێستاش خراپەو خراپەکاری دەدەنە پاڵ حەزرەت، ئەگەرنا ئەگەر نووسەر لەوەی بکۆڵیایەتەوە کە ئەمانە سیفەتی کە سێکی سادەنینو هەرواش بە ئاسانی ناکرێتو نابێت کەسێك لە ناو هۆزێکی زۆر نەفامو جاهیل بەهەموو بنەمایەکی ئینسانیی کەسێك لە سەردەمێکدا کە بەهێزەکان بێهێزەکان دەپلیشاندەوە، داوێن پیسی لەوپەڕیدا بوو، سوو خواردنو خەڵك فرۆشتن گەیشتبووە چڵەپۆپە، لە ناو ئەو ژینگە نەخۆشەدا کەسێکی وا هەبێت ئەوەندە سیفاتی بەرزی هەبێت، جێگەی سەرنجە کە نووسەرو ئەوانەی وەك نووسەر گومانیان لە قسەی ئەو پیاوە هەبێت کە نەیارە سەرسەختەکانی دەستەوسان ماون لەوەی بتوانن گومانێك دروست بکەن، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی سیفەتێکی خراپەوە دژایەتی بکەن، ناچار فشاری هێزیان بەکارهێنا، لەوەوە ڕوون دەبێتەوە کە کەسێك لە ژیاندا درۆی لەگەڵ خەڵك نەکردبێت چۆن دەکرێتو چ عەقڵێك قەبوڵی دەکات درۆ لەگەڵ خۆی بکات؟! کەسێك بەگەنجی خۆپارێزی کردبێت ناکرێتو جێگەی باوەڕ نییە کە

[1] تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، ج2، ص847.

[2] تفسير فتح القدير، شوكاني، ج3، ص234.

بەکاملّی بیکات؟! هەربۆیە دەڵێم باوەڕ نەهێنانی خەڵکانێك کە لە نزیکەوە حەزرەتیان ناسییەوە، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە پێشەوە باسمان کرد کە هیدایەت تەنها بەدەستی خودایە، ڕوونکردنەوە لە دەست ئینسانەکاندا دەمێنێت .

***نۆیەم:*** پ2، لا29، دێڕی (3) "مووی سەری زۆر بووەو تانیوەی گوێی دادەپۆشی، بەزۆری کڵاوێکی سپی لەسەر دەناو عەتری لەسەرو ڕیشی دەدا ... سروشتی خاکیو میهرەبانیی هەبوو...).

سەرجەم ئەو سیفاتانەی کە نووسەر باسیان دەکات بەراوردم کردوون لەگەڵ کتێبو سەرچاوە ئیسلامییەکاندا زۆریان پڕاو پڕوان، تەنها ئەو باسانەی کە دەڵێت "بەزۆری کڵاوێکی سپی لەسەر دەنا"، کە نازانم لە کوێوە هێناویەتی، بوونی ئەم پەرەگرافە وام لێدەکات کە گومانم لە خودی ڕەچەڵەكو مەزهەبی نووسەریش بۆدروست بێت، ئەگەرنا لەهەر شیعەیەك بپرسیت، کەوا بۆ هەندێ لە ئاخوندەکان عەمامەی ڕەش دەبەستنو هەندێکی دیکە سپی، ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەوەت دەداتەوە عەمامەی ڕەش نیشانەی سەیدییە، چونکە حەزرەت هەمیشە عەمامەی ڕەش بووە، لە ڕاستیشدا کتێبی (شمائل محمدیە)ی ئیمانی ترمذی گەڕام بەهیچ شێوەیەك باس لەکڵاوی سپی ناکاتو کڵاو لەو سەردەمەدا هەرنەبووە، تەنها خودەی جەنگو قەلەنسووە (کە شتێکی قوچەکییە لە شێوەی کڵاودایە) هەبووە، ئەگەرنا زیاترین شت عەمامەبووەکە بەبێ کڵاو بەستراوەتەوەو هەمیشە حەزرەت عەمامەی ڕەشی لەسەرناوە، دەکرێت بڵێین ئەوەش عورفی ئەوکاتە بووە، هیچ پەیوەندییەکی بەڕەنگەوە نییە .

## هاتنە خوارەوەی وەحی (البعثة)

***یەکەم:*** پ(3–4)، لاپەڕە 30 دێڕی (1–8) "لێرەدا خراپ نییە کە فەرموودەیەك لە عائیشەوە بگێڕینەوە کە زۆربەی قسەزانە... بە بەڵگە هێناویانەتەوە کە دەڵێت (لەسەرەتاوە وەحی وەك خەیاڵاتو خولیای چاکە سەری لێدەداتو وەك شەبەقی بەرەبەیان سپی بوو...)".

کێشەی ئەم نووسەرە تەنها ئەوە نییە کە لە مێژوو نازانێت، بەڵکو نووسەر لە عەرەبیدا زۆر کۆڵەو لە کاتێکدا تەرجەمەیەك تێناگات بەکەیفی خۆی وشەی بۆ زیاد دەکات، کێشەی لەمەش ئاڵۆزتر ئەوەیە وەرگێڕە کوردەکەش قوڕەکە خەستر دەکاتەوە، ئەوەتا سەرجەم کتێبە مێژوویی و ئەو سەرچاوانەی کە نووسەر باسیان لێوە دەکات کە گەورە پیاوانی فەرموودە بەبەڵگە ئەو فەرموودانەیان هێناوەتەوە باسی خەیاڵاتو چاکەخوازی لە فەرموودەیاندا بەدی ناکرێت، بۆ ڕاستیی قسەکانمان ئەوەش فەرموودەکە "قال البخاري حدثنا يحيى بن بكير، حدثنا الليث عن عقيل عن ابن شهاب عن عروة عن عائيشة، أنها قالت: أول مابديء به رسول الله (ﷺ) من الوحي الرؤيا الصادقة في النوم، فكان لا يرى رؤيا الا جاءت مثل فلق الصبح، ثم حبب إليه الخلاء، فكان يخلو بغار حراء فيتحنث فيه..."[1].

سەرەتا هەردوو وشەی خەیاڵاتو چاکەخوازی نووسەر لە خۆیەوە هێناویەتی، (فلق الصبح) وەردەگیرێت، لە کاتێکدا بە مانای جیابوونەوەی شەو لە ڕۆژ دێت، کە مانای حەقیقی بەڕوونیی ڕۆژ دێت، نەك سپیایی ڕۆژ، لە هەمان پەرەگرافی دوای ئەمەدا وشەی (حتى بلغ منى الجهد) جارێك بە بوورانەوە ڕاڤە دەکات، جارێکی دی بە هێز لێبڕان، لەمەوە دەردەکەوێت وەرگێڕانی ئەم نووسەرانە وردو بێ خەوشە!!.

***دووەم:*** پ4، لا34 دێڕی (1–6) "ابن اسحاق دەڵێت لە ڕۆژگارەکانی بەر لە هاتنە خوارەوەی وەحیدا محمد بۆ دەست بە ئاو گەیاندن هەموو جارێك لە ماڵەکانی مەککە دوور دەکەوتەوە، تاوەکو لە بەرچاو ون دەبوو کە بەلای هەرلا بەردو

[1] البداية والنهاية ج3، ابن كثير ص5، السيرة النبوية، الصلابي، ص97، ج1، السيرة النبوية، لابن هشام، ج1، ص234.

داریکدا تێپەڕ دەبوو سڵاویان لێدەکرد"، هەروەها لە پ5، لا34 "ئاشکرایە کە نە دار دەتوانێت قسە بکاتو نە بەرد، چونکە ئامێری دەنگیان تێدا نییە".

هەروەها پ5، لا34، پ1، لا35"ئەم مەسەلەیە نا دروستو دوور لە مەنتیقی عەقڵە، زۆربەی فەقێیەکانو لێکۆڵەروان ڕەتیان کردووەتەوە" هەروەها پ3، لا35 دێڕی (2-5) "...چونکە خودی محمد هیچی لەمبارەیەوە نەوتووەو فەرموودەیەك، یان بەڵگەیەکی باوەڕپێکراوو بە متمانەش لەمبارەیەوە نەوتراوەو نەهاتووە".

**وەڵام:** بۆچوونی زۆر نووسەرم دیووەو خوێندنەوەشم بۆ هەندێکیان هەیە، بەتایبەت زۆرێك لە نووسەرە بەناوبانگ و بە ئینسافەکان کە بۆچونێکی هەبێت ئەوە دەگەیەنێت کە بۆ چوونەکەی بەڕاست دەزانێت ئیحتیمالی ئەوەش دادەنێت کە هەڵەی تێدابێت، لە هەمانکاتدا بۆچوونی بەرامبەر بەهەڵە دەزانێت و ئەوەش ڕەچاو دەکات کە بۆی هەیە ڕاست بێت، بەڵام نووسەری بەناو (عەلی دەشتی)و وەرگێڕی بەناو (فریاد کە ریم) هەرگیز کەسی وەك ئەمانەم بەرچاو نەکەوتووەو نەبیستووە ئەوەندە بە ڕەهایی ڕاو بۆچوونی خۆیان بدرکێنن، لە کاتێکدا ئەوان قسە لەسەر مێژوو دەکەن، مێژووش بەهەموو ئەو ڕاستو چەوتانەی دەربارەی ڕووداوێك لە مێژووی نزیکدا چ جای ئەوەی سەرچاوەی ئەم نووسەرە هەموو نادیارو گوماناوین، ئەگەرنا تا ئێستا چەند سەرچاوەی باوەڕپێکراوو قابیلی قەبوڵی ئیسلامییمان بەراورد کرد زۆرینەی بە هەڵەدا چووبوو، سەبارەت بەم ڕووداوەی (ابن اسحاق)، مرۆڤ هێندەی بەسە کە دەسەڵاتی خودا بزانێت کە مرۆڤی دروست کردووەو لە نەبوون هێناویەتیە بوون، ئیتر سادەو سانایە ئەو خوایە بتوانێت بەردو دار بهێنێتە قسەو گفتوگۆ، مەرجیش نییە نەبوونی ئامێری دەنگ گرفت بێت لە دەنگ، چونکە بەبڕوای عەقڵی تەسکی نووسەر تەنها دەنگ لە ئەنجامی لەرینەوەی دەنگە ژێیەکان دروست دەبێت لە کاتێکدا وانییە، زۆرێك لەو ئامێرە تازانەی ئەمڕۆ هەیە دەنگە ژێی هەر تێدا نییەو دەنگی جوانو ئاوازی خۆشیشیان لێ پەیدا دەبێت، لە ڕووی ئەوەشی کە ئەم دەنگەی بەردوداره دووربێت لە مەنتیقی عەقڵ، دەڵێم کام عەقڵ؟.

چونکە مەسئەلەی باوەڕپێکردن بەکردارێك، یان بە گوتارێك شتی پێشینەی دەوێت، یان هەندێکجار نایەوێت کە وا کارێکی نیسبیە، بەڵام زۆرجار بەهۆی کارێکی دیکەوە باوەڕ دروست دەبێت بە کردارێکی دیکە، هەربۆیە لە لای مسوڵمانان بڕوا هێنان بەخودا، بڕوا هێنانە بە نێردراوەکەی، چونکە لە لای بڕوادار مەنتیقیەو ئامرازو هۆکارێکی دیکە بەدی ناکات لە ڕێگەیەوە پەیامو ڕێنموونییەکانی خودای خۆی وەرگرێت، تەنها لە ڕێگەی پەیامەوە نەبێت، ئەویش تەنها دەکرێت لە ڕێگەی کەسێکەوە بێت کە خودای خۆی هەڵیبژێرێت، ئیتر سادەو ئاساییە ئەو نێردراوە بەرد سەلامی بۆ بکات، یان دارو جێگەی باوەڕیشە، بەمەرجێك خەبەرەکەی بەڕاستو دروستیی گەشتبێتە ئێمە، ئەوەش کە زۆربەی فەقێکانو لێکۆڵەرەوەکان ڕەتیان کردووەتەوە، نازانم بۆ ناوی دوان، یان سیانیان ناهێنێتو بەتەنهاش ڕەتکردنەوەی بێبەڵگە لە لای مسوڵمان جێگەی قەبوڵ نییە، چونکە ئەم بابەتە، فەرموودەی ڕاستو دروستی لەسەرە، نەك ئەوەی کە نووسەر دەڵێت "خودی (محمد) هیچی نەوتووە" ئەوەتا لە فەرموودەیەکی ڕاستی حەزرەتدا هاتووە "عن جابر بن سمرة قال: قال رسول الله (ﷺ) (إني لأعرف حجرا بمكة كان يسلم علي قبل أن أبعث إني لأعرفه الآن)" أحمد ومسلم والترمذي [1].

جەنابی نووسەر بانەختێك خۆت زەحمەت بدایەو هەندێ کتێبی فەرمووده بگەڕایتایە، نەك پەنا بەریتە بەر درۆی شاخدار، مێژووی زیاتر لە (1400) ساڵو گەورەترین سەرمایەی دیکیۆمێنتدار بە هەوڵێکی نەزۆك لەکەدار بکەیت، سەرچاوەش زۆرنو لە بەردەستی هەموو کەسێکدایە، جاران نییە کە چەند کتێبی کەم لەبەردەستی چەند کەسێکی سنووردار بێت، جیهانی عەولەمەو ئینتەرنێت کارەکەیان هێندە ئاسان کردووە، هەم درۆ زوو ئاشکرا دەبێت، هەم زانیاریش زوو دەستدەکەوێت.

[1] السيرة النبوية لابن هشام ج1،ص234. السيرة النبوية، محمد محمود الصلابي، ج1، ص96.

## پاش هاتنە خوارەوەی وەحی

**یەکەم:** پ1، لا37، دێڕی (1) "سەرەتای بانگهێشتی ئیسلام بەتەواوی ڕوون نییە".

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم کتێبە کە زیاتر لە حیکایەت دەچێت، نەك کتێبێکی ڕەخنەگرانە، ئەوەیە زۆرجار کە ڕەخنەو گومانێك دروست دەکات بیر لەوە ناکاتەوە کە بەڵگەیەك بدات بەدەستەوە، بۆ ئەوەی ڕەخنەکەی جێگەی قەبوڵ بێت، هیچ نەبێت پێویست بە بیرکردنەوە بکات. ئەوەتا لەم ڕەخنەدا باس لە دیارنەبوونی سەرەتای بانگەواز دەکات، لە کاتێکدا سەرجەم نووسەرانی سیرە لەسەر ئەوە کۆکن کە پاش هاتنە خوارەوەی ئایەتی (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ) حەزرەت تەواو دڵنیا بوو، کە کاتی پشوو ڕۆیشتو کاتی ڕووداوی تازە جێی گرتووەتەوە، بەوەی دەبێت دەست بکات بە بانگەواز، وەك لە دەقی ئایەتەکەوە دەردەکەوێت فەرمانی خودای کاربەجێیە کە دەستبکات بە بانگەواز.

**دووەم:** پ1، لا37، دێڕی (5-8) "... بەڵام لەگەڵ ئەو حەوت، تا دە سوورەتەی کە پاش سورەتی (العلق) هاتە خوارەوە جێدەستی دژایەتیکردنو گاڵتەپێکردنو ئینکاریکردن لە خەڵکدا دەرکەوتو لە ئاکامدا حاڵەتی گومانو دوو دڵیی و ڕاڕایی بوون لە (محمد)دا دەبینرێت".

ئەوانەی توێژینەوەیان لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)دا کردووە بە جیاوازی بیرو بۆچونیان، ئەوەیان بەڕاشکاوی باس کردووە. کە حەزرەت لە ژیانیدا، لە سەرەتای بانگەواز هەتا ئەو ڕۆژەی لە دنیا دەرچووە، بەڕۆحیەتێکی بوێرانەوە و بێگوێدانە کۆسپو لەمپەرو بێماندووبوون ئەرکی پێغەمبەرایەتی خۆی بەجێهێناوە، لە ناڕەحەتیترین حاڵەتدا هەڵوێستی ماندوونەناسانەی نواندووەو لە ترسنکاترین کاتدا ئازایانەترین ڕووداوی خوڵقاندووە.

ئەوەتا لە یەکەم حاڵەتی بتپەرستیداو چەند خوایەتیدا بانگەواز ئیعلان دەکات، زۆرترین کات بێباوەڕانی قورەیش ماندوو دەبوون لە هەوڵدان لەگەڵ خودی حەزرەتداو پەنایان دەبردە بەر مامی، بەڵکو کاریگەرییەکی لەسەری هەبێت، هەندێجار ئازاری هاوەڵانیان دەدا، چونکە دەیانزانی لەگەڵ خودی خۆیدا ناتوانن بەهیچ شێوەیەك کاریگەریان لەسەری هەبێت، بەڵام نازانم بۆ نووسەر ئەمانەی بەیادنەهاتووەتەوە؟!! لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بابەتانە ئاشکراترین هەڵوێستەکانی حەزرەتن لە بەرامبەر نەیارانیدا، لە هەمانکاتدا مرۆڤێك بێتاقەت بوو گومان لە دڵیدا ڕوودەدات کە بڕوای لاواز بێت بە شتێك، حەزرەتیش ئەوەندە دوورە لەوە کە هەرگیز گومانی وا بەو نابرێت، دەکرێت ئەوە بڵێم کە نووسەر لە بیری چووە لەم پەرەگرافەداو لەم لاپەڕەیەدا ئەمە باس دەکات، بۆیە لە لاپەڕەی (39)ی هەمان کتێب لە پەرەگرافی (4) دەڵێت "بەرامبەر بەسووکایەتی و بوختانو ناوو ناتۆرەی ئەوان دەستی لە خەبات هەڵنەگرتووەو کۆڵی نەداوە".

ئەگەر ئەم قسانەی نووسەر بەجدی سەیر بکرێن دژایەتییەکی نالۆژیکی ڕوودەدات، هەربۆیە دەڵێم خۆزگە نووسەر دوای تەواوبوونی کتێبەکەی بەوردی دەیخوێندەوە، بۆ ئەوەی بزانێت چ بەرهەمێکی پێشکەش کردووە، لەگەڵ ئەوەی سەرەتای پەرەگرافەکە باس لە هاتنەخوارەوەی حەوت تا دە سوورەت دەکات، کە گوایە دوای سورەتی (العلق) هاتوونەتە خوارەوە، دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەو ڕەخنەیەی کە گوایە قورئان خراپ ڕێکخراوە، چونکە نووسەرو هەمووشمان دەزانین کە سورەتەکان بەیەکجار نەهاتوونەتە خوارەوە، دەبوایە بیوتایە ئەم چەند ئایەتەی دوای بەشی یەکەم سورەتی (علق) هاتنە خوارەوە، لە هەمانکاتدا لە پ1، لا43، دێڕی (19) دا دەڵێت "... لەگەڵ ڕاستیی و خۆڕاگریی و ئەمانتدارییەکەیدا ناکۆکە، کە بە گەورەترین تایبەتمەندییەکانی (محمد) دەژمێردرێت، لە لایەکی دیکە ئەو هەموو هەوڵو بەرانگارییانەی بێباوەڕان بە وتەی (والله لو وضعوا الشمس في يميني والقمر في يساري على أن أترك هذا الامر ما تركته حتى أهلك دونه....." شکست بێ دەهێنێت، هیچ کات بێتاقەتیی و گومانی لە خۆیو بەرنامەی نەبوو بەدەرنەکەوتووە".

**سێیەم:** پ3، لا38 دێڕی (1) "دەبێت چ شتێك ڕووی دابێت کە خودا دڵی موحەممەد دەداتەوەو هانی دەدات، ئایا ئەم سورەتە دوای بڕانی وەحی هاتووە".

ئەوەی تۆزقاڵێك زانیاری هەبێت، لە کاتی ڕاڤەکردنی ئایەتدا هەوڵ دەدات هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە، یان ئەم سورەتە بزانێت، تاوەکو ئاشنابێت بە ڕاڤەکەی، بەڵام نووسەر ئەم هەوڵە نادات، بەڵام دڵنیام لەوەی ڕاڤەکارانی قورئان سەرەتا هۆی هاتنەخوارەوە باس دەکەن‌و پاشان یەکەیەکەی ئایەتەکان، دیارە مەبەستی نووسەر لێرەدا ڕوونە، بۆ گومان دروستکردنێکە، کە ئایا بۆ ئەم سورەتە بە سورەتی یازدەهەم ناونراوە، لە کاتێکدا ماناکەی وا دەکات کە سورەتی دووەم بێت؟! ئەوەی سەرنجی ئەم نووسەرە بدات دەبینێت لە گومانێکی سەرسوڕهێنەردا دەژی، گومانی هەیە لە هەموو شت، هەموو ڕووداوو هەموو مێژوو، بۆیە خۆی دووچاری نەخۆشی دەروونیی گومان بووەو دەیەوێ خۆی بە ئەسڵ، ئێمەی خوێنەر بە نەخۆش قانع بکات، ئەگەرنا لە هۆی هاتنەخوارەوەی سورەتەکە دیارە کە (أم جميل) خێزانی (أبي لهب) پاش ئەوەی پەنجەیەکی حەزەرت بریندار دەبێت بەهۆی بەردێکەوەو بۆ ماوەی چەند شەوێك ناتوانێت هەڵسێت بۆ شەونوێژ، نیگا (وەحی)ش لەوکاتەدا نایەت، ئەم ئافرەتە دەگاتە حەزرەت، دەڵێت وا دیارە شەیتانەکەت وازی لێهێناویت، لە وەڵامی ئەم ئافرەتەدا ئایەتەکانی سورەتی (والضحى) هاتوونەتە خوارەوە، شتێکی دیکە ئەوەیە مەرج نییەو نەشبووە هەموو ڕۆژێك وەحی هاتبێت‌و ئایەتەکانیش باسی بێتاقەتیی حەزرەت ناکەن، هیچ موفەسیرێك باسی لەوە نەکردووە، بۆیە ئەمەش یەکێکە لەو گومانانەی کە نووسەر دروستیکردووە.

## ژینگەی سەرهەڵدانی ئیسلام

پ(4-5) لا51، دێڕی (1-5)، (1-3) "...بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ئیسلام لە مەککەدا گەشەی نەکردوو (13) ساڵ بانگهێشتی بێ‌پسانەوە ... بەشێوەیەك دەڵێن کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەوێدا بوونەتە مسوڵمان نەگەیشتوونەتە سەد کە س".

"...جیهادی واقیعیانەو بەردەوامو شەوو ڕۆژەی موحەممەد لە ماوەی (13) ساڵدا نەیتوانی ملنەدات‌و خۆڕاگری قوڕەیش تێکبشکێنێت‌و ئەوانەشی کە ئیمانیان هێنا بە پەنجەکانی دەست دەژمێردران.."

دوو پەرەگرافی دژ بەیەك لە یەك لاپەڕەدا، لە یەکێکیاندا ژمارەی ئیمانداران نەگەیشتە سەدو لە پەرەگرافی دووەمدا ژمارەیان بەپەنجەی دەست دەمێردران!!، هێندەی دوو پەرەگرافەکە دژیەکن، بە چەند ئەوەندەش زانیاریەکان دوورن لە ڕاستییەوە، سەرەتا پەنجەی دەست لەیەك تا دە دەکات‌و ژمارەی سەد بەدەیەها ناودەبرێت، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکە ژمارەی ئیماندارانی کۆچ کردوو بۆ حەبەشە لە سەفەری یەکەم (14) کە س بوون کە (10) کەسیان پیاوو چواریان ئافرەت بوون، لە سەفەری دووەمی کۆچ بۆ حەبەشە (83) پیاوو (18) ئافرەت کە (11)یان قوڕەیشی‌و (7)یان غەیرە قوڕەیشی بوون، هەر نزیك لەم ژمارەیە کۆچیان بۆ مەدینە کرد، کە هەندێك بە (72) پیاو (2) ئافرەت باسی لێوە دەکەن، لە کاتێکدا کە تیرەی بەنی شیبان مسوڵمان بوون، ژمارەیان لە (1000) کەس تێدەپەڕی‌و ژمارەی مسوڵمانانی مەدینە لە عەقەبەدا (73) پیاوبوون، ئەمە جگە لەو مسوڵمانانەی کە لە مەککەدا بوون‌و جگە لەو مسوڵمانانەی کە خێزان‌و منداڵی گەنجی ئەو سەردەمە بوون!!، موحەممەد (ﷺ) بە (13) ساڵ توانی مێژوو بگۆڕێت، بە ژمارەی پەنجەی دەست نەیگۆڕی! هەربۆیە دەبوایە نووسەر ئەوەندە وردبوایە کە ژمارەکانی تێکەڵ نەکردبایەو ڕاستییەکانی وەك خۆی باس بکردایە[1].

## موعجیزە

سەرجەم زمان‌و دیالێکتەکانی دونیا نزیکبوونەوەیەکیان هەیە لە ڕووی وشەوە، بە تایبەت ئەوانەی سنووری جوگرافیان لەیەکەوە نزیکە، هەندێکی دیکە بەهۆی هاتوچۆی بەردەوامیان‌و هەندێکی‌تر بەهۆی مەرجەعیەتی فیکریی، یان ئایدۆلۆجی، هەربۆیە هەندێك لە وشەکان بوونەتە وشەی هاوبەش‌و هەمان مانا دەبەخشن، زۆرجاریش ئەگەر

[1] السيرة النبوية، علي محمد محمود الصلابي ج1، ص328-334-349-408,425-435.

تەرجەمەکەی بەکاربهێنرێت دەبێت وشە هاوبەشەکە لە نێوان کەوانەدا بنووسرێت بۆ ئاسان ناسینەوەی واتاکەی، بێگومان وشەی موعجیزە وشەیەکی لە بنچینەدا عەرەبییەو بەهۆی مەرجەعیەتی ئایینەوە بە ئێمە گەیشتووە، هەربۆیە بۆ زانینی مانا ڕاستییەکەی دەبێت بزانین لە زمانی عەرەبیدا بەچی دەوترێت موعجیزە، تاوەك بەڕاستی بەکاری بهێنین، وشەی موعجیزە لە عەرەبیدا بریتییە لە (أمر خارق العادة، يعجز البشر أن يأتوا بمثله) واتە "کارێك، یان کردارێك کە لە ئاساییدا وانە بێت بەمانای لە دەستدانی سیفەتی سروشتی کارێك، یان کردارێك، وەك ئەوەی سووتاندن لە ئاگر بسەنرێتەوە، یان خنکاندن لە ئاو بسەندرێتەوەو ...هتد.

کە ئەم کارانە لە توانای بەشەر بەدەرن، بۆیە هەرکاتێك باسی موعجیزە دەکرێت پێویستە سەرنجمان بۆلای ئەوە بڕوات کە کارێکی نائاساییە، لەگەڵ ئەوەی دەبێت ئەوەمان لە بیرنەچێت لە ئەدەبیاتی ئیسلامدا، جگە لە موعجیزە کەرامەت هەیە کە بریتییە لە توانایەك خوای میهرەبان بە کەسێکی دەبەخشێت‌و لە توانای کە سێکی دیکەدا نییە، خاڵی گرنگی جیاکەرەوەی موعجیزەو کەرامەت ئەوەیە موعجیزە بۆ پێغەمبەران دەبێت‌و کەرامەت بۆ ئیمانداره ڕاستەقینەکان، لەبەرئەوەی نووسەرو وەرگێڕیش نەشارەزان لە ئەدەبیاتی ئیسلامیی، هەردووکیان تێکەڵ کردووەو وەك یەك شت باسی لێوە دەکەن کە ئەم کێشەیە زۆرجار دووبارەو چەندبارە دەبێتەوە لەو نووسەرانەی کە شارەزاییەکی ئەوتۆیان نییەو دەکەونە نووسینی بابەتی ڕەخنەیی بەبێئەوەی پرەنسیپەکانی ئایینی ئیسلام شارەزابن، هەربۆیە سەرجەم بەرهەمەکانیان نەزۆك‌و دوور لەواقیع‌و بێ‌بەڵگە دەبن، ئەمەش لەلایەك گرفتێکە خودی نووسەرەکان دووچاری خۆیانی دەکەن بەشێوەیەکی گشتیی، لە لایەکی دیکە خەتای ئێمەی مسوڵمانی تێدایە کە گوتاری مەعریفی‌و سیاسیمان لاوازە.

پاشان ئەوەمان لە بیر نەچێت کە ئایا موعجیزەکان بۆچین‌و پێغەمبەران بۆ بەکاریان هێناوە، ئەوەی گومان هەڵناگریت موعجیزە بۆ قۆناغێکی تایبەتییەو مەبەست لێی پیشاندانی دەسەڵاتی خوای گەورەو پەیوەستی نێوان پێغەمبەران‌و خواوەندە، لە کاتی وەڵام نەدانەوەی بەندەکان بۆ پێغەمبەران‌و بڕوا نەهێنانیان‌و سەرپێچی کردنیان، پێغەمبەران پەنای بۆ دەبەن، نەك بەشێوەیەکی بەربڵاو بەردەوام، چونکە ناکرێت ئەم موعجیزەیە هەمیشە بەردەوام بێت، بەتایبەت بۆ سەردەمی حەزرەت کە کۆتا پێغەمبەرە.

ئەوەشی کە گومانی تێدا نییە، کە هەرسەردەمێك شتێك دەبێتە باو لە ناو خەڵکدا، بۆ نموونە لە سەردەمی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) جادوو (سیحر) بەشێوەیەکی بەربڵاو تەشەنەی کردبوو، بۆیە پێویست بوو لە دژی ئەو ساحیرانە موعجیزەیەك ڕووبدات بۆ بەرپەرچدانەوەی فیرعەون‌و دارو دەستەکەی، هەندێ سەردەمی دیکە پزیشکیی‌و چارەسەرکردن زۆر باوبوون، لە هەندێ سەردەمیشدا بەلاغەو ڕەوانبێژی بۆتە باو، وەك لەناو عەرەبەکانی سەردەمی حەزرەتدا، بۆیە دەبێت وتەیەك لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە هەبێت کە کەس نەتوانێت وەك ئەوە بڵێت، جا ئاخۆ قورئان لەڕووی ناوەڕۆکەوە موعجیزەیە، یان لەڕووی شێوە، یان هەردووکیان؟ بەهەرحاڵ ئەوە موعجیزەیەو جولەکەکان زیاتر هانی نەیارانی حەزرەتیان دەدا بۆ داواکردنی، چونکە لە ڕاستیدا جولەکە هۆزێکی ڕکەبەرو گوماناوین‌و لە هەموو شتێك دەسڵەمینەوە.

***یەکەم:*** پ1، لا54، دێڕی (1–5) "هەر ئێرانییەك کە دەرك‌و دیواری ماڵەکەی موعجیزەی لێ دەبارێت‌و هەر ئیمامزادەیەك (تەنانەت بێناونیشان‌و نەناسراویشە) کە بەردەوام موعجیزە دادەتاشێت، بەڵام کاتێك سەیری قورئان دەکات سەرسام دەمێنێت ... هیچ جۆرە شوێنەوارێك لە موعجیزەو پەرچوو لە قورئاندا نییە".

نووسەر لەم پەرەگرافەدا پێوانەیەکی سەیرو سەمەرە دەکات، دێنێت هەڵسوکەوتی تاکێکی ئێرانی چ شارەزابێت یان نەشارەزا، لەسەر ئیسلام حسێب دەکات‌و دەیکاتە ڕەخنە لەسەر ئیسلام، لەکاتێکدا ئیسلام کۆمەڵە پرەنسیپێکە بەکەسەکانیدا هەڵناسەنگێندرێت، بەڵکو بەناوەڕۆکی پرەنسیپەکانیدا، دەکرێت ڕەخنە بگیرێت لە هەڵسوکەوتی تاکێك، بەڵام ئەو ڕەخنەیە ناچێتە سەر ئیسلام، چونکە ئەگەر ئیسلام ئەو تاکەی فێری ئەوە کردووە جێگەی قەبوڵەو، ئەگەرنا بوختانەو ئیسلام لێی بەرپرسیار نییە، لە لایەکی دیکە بەهۆی خۆشەویستی زیاد لەڕادەی مسوڵمانان بۆ پیاوچاکان‌و دڵسۆزانی پێشینەی مسوڵمان، دووچاری هەندێ هەڵەو کەموکوڕی بوون. سەبارەت بە ئێرانییەکان، بەهۆی

خۆشەویستی زیاد لە ڕادەی ئاڵو بەیتو چەند زیادە ڕەوییەکیان هەیە لەو بوارەدا کە نابنە ماڵ لەسەر ئیسلام بەرنامەکەی، لە هەمانکاتدا نووسەر خراپ حاڵی بووە کە دەڵێت، "کاتێك سەیری قورئان دەکەیت سەرسام دەمێنیت" چونکە نووسەرو وەرگێڕیش بەدوای ئەوەدا هەمان هەڵەیان دووبارە کردووەتەوەو لەموعجیزە تێنەگەیشتوون، قورئانیش شارەزا نین، تا بزانن قورئان کوێی موعجیزەیەو موعجیزەی کامەیە.

***دووەم:*** لەم بابەتەی نووسەردا ڕەخنە لە موعجیزە دەگرێتو کۆمەڵە ئایەتێك باس دەکات کە گوایە کافران داوای موعجیزەیان کردووەو حەزرەت، یان بێدەنگ بووە، یان فەرموویەتی من مژدە بەخشم، ئایەتەکانیش نووسەر باسیان دەکات لە دوو شوێنی جیاوازدا بە (20) بابەت، جارێك بە (25)جار کە ئایەتەکانی (90، 91، 92، 93)ی سورەتی (الاسراء)و (7–8)ی سورەتی (الفرقان)، (6، 7)ی (الحجر)و (3، 4، 5)ی الانبیاء (20)ی (یونس)و (7)ی (رعد)و (50)ی (العنکبوت)و (109، 110، 111)ی (ألانعام).

پاش دیاریکردنو خوێندنەوەی هۆکاری هاتنەخوارەوەو ڕاڤەی ئایەتەکان ئەم سەرنجانەم لا دروست بوو:

1. نەهاتنی موعجیزە لە سەر داوای کافران کارێکی سروشتییە، چونکە بڕواهێنان وای لێدەهات هەرکەس بیویستایە باوەڕبهێنێت دەبوایە موعجیزەیەك بەتایبەتیو لە سەر داوای ئەو بهاتیە خوارەوە، ئەمە لە کاتێکدا لەو سەردەمەدا ژمارەی کافران کەم بووە لەبەرکەمیی دانیشتوان کارەکە درێژەی دەکێشا، بۆ ئەم سەردەمەش و هەرکەس داوای موعجیزەی دەکردو خیتابی عەقڵییو مەعریفی قورئان کاریگەریو ڕۆڵی نەدەما، قورئان دەبووە کتێبی موعجیزەکان.

2. هەندێك لەو کە سانەی کە داوای موعجیزەیان دەکرد پاش ماوەیەك مسوڵمان بوون ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاویشیان هەبوو لە بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، لەوانە (أبوسفیانو عیکرەمەی کوڕی أبو جەهل) کە یەکەمیان حەزرەت دەینارد بۆ شکاندنی بتەکانی بێباوەڕانو عیکرەمەش سەرکردەیەکی لێوەشاوەی سەربازیی بوو، هەربۆیە داواکاریی موعجیزە لە لای هەندێکیان بیانوویەك بوو بۆ باوەڕهێنان.

3. عینادیو ملهوڕی هەندێکیان لەو سەرانە لە زانیاری خوای کاربەجێدا بوو کە ئەگەر موعجیزەش هەبێت ئەوان باوەڕیان نەدەهێنا، هۆزەکانی پێغەمبەرانی دیکە شاهیدی ئەو حاڵەتەن.

4. وەڵامی حەزرەت سەبارەت بەوەی موعجیزە بەدەستی ئەو نییە بەڵگەیە لەوەی کە ئەو زیرەکییەی نووسەر باسی دەکات سەبارەت بە حەزرەت کە مەبەستی تری هەیە، کە هۆکارەکەی ئەوەیە بەرنامەی ئیسلام حەزرەتی والێکردبوو کە زیرەك بێت، ئەگەرنا کە باسی موعجیزەی پێغەمبەرانی پێش خۆی دەکات دەزانێت کە خۆشی داوای موعجیزەی لێدەکرێت، ئەگەر مەسەلەکە زیرەکی بوایەو ئەمانەتی ئیسلامی نەبوایە، یان باسی نەدەکرد، یان ئەگەر وەك نووسەر ئاماژەی بۆ دەکات کە ئایەتەکان خۆی دەینووسین، ئایەتێکی باس دەکرد کە موعجیزە لە مەودوا نایەت.

5. لە سەرەتادا باسمان کرد کە موعجیزە بە شێوەیەکی دەگمەنو کەم ڕوودەدات، بۆ ئەوەی تەنها حاڵەت بێت بۆ کرانەوەی هەندێ دەرگا، ئەگەرنا خیتابی عەقڵیی قورئان کلیلی سەرجەم دەرگاکانی دیکەیە.

6. زۆرێك موعجیزە لە کاتی خۆیدا لە سەر دەستی حەزرەتدا ڕوویان داوەو سەرجەم قوڕەیش بینیویانە، وەك شەقکردنی مانگ، بەڵام ملهوڕەکانی قوڕەیش باوەڕیان نەهێناوە، بەسیحرو جادو لە قەڵەمیان داوە.

7. داواکاریی لەسەر موعجیزەش کارێکی ئاستەمە، چونکە ڕوودانی موعجیزە لەسەر داوای قەومێك ئەگەر باوەڕیان پێنەهێنا دووچاری سزای سەختی دەستبەجێ دەبن، دەکرێت ئەوە بوترێت کە حەزرەت خۆی حەزی لەوە کردووە کە قەومەکەی بەخیتابی عەقڵیی باوەڕ بهێنن، چونکە دوعای حەزرەت ڕەدبوونەوەی نەبووە.

**سێیەم:** پ7، لا57، دێڕی (1–2) "واتە ئایا ناردنی قورئان بۆ تۆ بەس نییە کە تێیدا هەرەشەو ڕەحمەت بۆ ئەهلی ئیمانە".

خوێنەری بەڕێز ئەمە ڕاڤەی ئەم ئایەتەیە (أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ).

ئایەتی (51) سورەتی العنکبوت، کە هەر خوێندەوارێکی سادەی عەرەبیزان دەزانێت، نەك ئەوە ڕاڤەکەی نییە، بەڵکە وشەی هەرەشە لە هیچ وشەیەکی ئەو ئایەتە وەرناگیرێت، کە ئەم نووسەرەو بەدوایدا وەرگێڕەکەی نازانم لە کام سەرچاوەوە ڕاڤەیان کردووە، بۆیە ئەوە سەرجەم تەفسیرەکان دادوەر بن لە نێوانماندا!.

سەبارەت بە دانەری کتێبی (الفرق بین الفرق) لە لایەن (عبدالقاهر بن طاهر بن محمد البغدادي)وە نووسراوە، نووسەر، یان وەرگێڕ بەهەڵە ناوەکەی نەقڵ دەکەن.

پاشان ئەوەی نووسەر ئاماژەی پێدەکات سەبارەت بە (إبراهیم نظام) کە وا زانایەکی پێشووە لە ڕیزی زانایانی مسوڵمان، بەهەڵەدا چووە، دەبوایە کە باس لە کتێبی (الفرق بین الفرق) دەکات چاوێکی بخشاندایە بەو کتێبەدا تا بزانێت ئیبراهیم نظام کێیە؟

النظام: أبو إسحاق ئیبراهیم کوڕی سەیار ناسراو بە نظام، کە خوشکەزای أبی هذیل عەلافە کە لە سەردەستی ئەم بووە بە موعتەزیلە، بەیەکێك لە زیرەکترین ئەندامانی موعتەزیلە دادەنرێت. لە گەڵ ئەوەشدا لە (12) بابەتدا ڕای جیاوازی هەبووە لە هاومەزهەبەکانی[1]، سەبارەت بە قورئان لە ڕووی لە فزو درکاندنەوە، سەرجەم موعتەزیلە یەکڕان لە سەر ئەوەی لەفزو درکاندنی موعجیزەیە، جگە لە (نظام) کە ڕای جیاوازی هەیە[2]، سەبارەت بەڕا جیاوازەکانی (سەرجەم بەشەکانی ئوممەت) لە هەردوو مەدرەسەی ڕەئی و فەرموودە، لە گەڵ خەوارج و شیعەو نەجاریەو زۆرینەی موعتەزیلە، یەکدەنگن لە سەر کافربوونی، هەروەها کتێبەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە لە تەکفیرکردنە نیزامدا کۆتاییان نایەت، بۆ نموونە (ابو الحسن الاشعری) (سێ کتێبی لە سەر کافربوونی نووسیوە)[3].

## قورئان لە ڕووی بێژەو درکاندنەوە

***یەکەم:*** پ1، لا67، دێڕی (1-3) "لەناو زانایانی پێشووی ئیسلامدا کە هێشتا ئەمارگیری و زێدەڕۆیی پەرەی نەسەندبوو، کەسانی وەك "إبراهیم نظام" دەبینرێت کە بەڕاشکاوی دەڵێت، ڕێکخستنی قورئان و چۆنیەتی داڕشتنی ڕستەکانی، نەك هەر موعجیزە نییە، بەڵکو بەندەکانی تری خوداش دەتوانن وەك قورئان یاخود باشتر لەویش قورئان بهۆننەوە".

هەروەها لە پ2، لا(68) دەڵێت" عەبدولقادر بەغدادی لە کتێبی (الفرق بین الفرق)دا ئەم بابەتەی لە زمانی (إبن راوندی)یەوە بۆ تانەو تەشەرو نارەزایی لە دژی (إبراهیم النظام)ەوە گێڕاوەتەوە.

ئەم زاتە ئەگەر ڕاستی دەکرد خۆ قورئان لە سێ شوێندا کە نووسەر ئیشارەتیان پێدەکات لە ئایەتی (13) سورەتی هودو ئایەتی (88) سورەتی ئیسراء ئایەتی (23) سورەتی البقرە. تەحەددا دەکات، با ئیبراهیم نیزام بیتوانیایە یەك ئایەت بڵێ و ئەو تەحەددایە هەڵوەشێنێتەوە.

***دووەم:*** پ3- پ4)، لا(67-68)، دێڕی (1-4)، (1-8) "ڕستەی کاڵ و کرچ و ناتەواو... ناکۆکیی و ناتەبایی لە خوێندنەوەی قورئاندا هەر ئەمەبێت، هەروەك ئەوەی کە (یا أیها المتدثر) بووە بە (یا أیها المدثر)و لێکۆڵەرەوە ناچارە بڵێ (ت) بوو بە (د) تێکەڵاوی (د) بوو، هەروەها (المتزمل) بووە بە (المزمل)".

سەرەتا لەبەر کلۆڵی نووسەر لە ڕووی زمانەوانی عەرەبییەوە کە زمانی عەرەبی بریتییە لە کۆمەڵە شێوەزارێك و هەر شێوەزارێکیش لە ناوچەیەکدا بووە، وەك هەموو زمانەکانی دیکە فەرق و جیاوازییەك لە وشەکانیدا هەبووە، پاشان وا دەزانێت تەنها ئەو هەستی کردووە بەم جیاوازییەو کەسی تر نەیدیووەو نەیزانیوە، ئەم گۆڕانەش ئەگەر تەنها لە قورئاندا کرابێت ئەوە

[1] الفرق بین الفرق، عبدالقاهر البغدادي، المكتبة العصرية، بيروت – 1998م، ص131.

[2] الملل والنحل، أبي فتح محمد بن عبدالكريم بن أبي بكر أحمد الشهرستاني، الجزء الاول، 1419هـ، 1998م، ص67، دار المعرفة.

[3] مقالات الاسلامين واختلاف المصلين، أبي علي بن اسماعيل الاشعري، ص225، ص3، 1980م.

دەکرێت بۆ هۆکارەکەی بگەڕێن ، خۆ ئەگەر سروشتی زمانی عەرەبی و خەڵکی عەرەب وابێت کە هەندێ پیت بگۆڕن و بە پیتی تر ئەوە سروشتی زمانەکەیە، بەمەرجێ هیچ لە واتاکەی نەگۆڕێت و کەموکوڕیەکیش بۆ پەرەگرافەکە دروست نەکات.

وشەی (مزمل و مدثر) هەردوکیان بەهەمان واتای (متزمل و متدثر) هاتوون، تەنها گۆڕانێك ئەوەیە کە پیتی (ت) گۆڕاوە بۆ هاوشێوەی پیتی دوای خۆی و بە دووبارەیی لە یەك پیتدا وتراوە، کە دەلالەت لە تەئکیدکردنەوە دەکات و بەڵگەش بۆئەوەی کە عەرەب ئەمەیان بەزۆری کردووە، ئەوەتا (امريء القيس) لە دێڕێك شیعردا ئەمەی کردووەو هیچ کێشەیەکی بۆ عەرەب دروستنەکردووە.

كأن ثبيرا في أفانين وبله

كبير أناس في بيجاد مزمل[1]

ئەوەش هەم هاوەڵانی حەزرەت هەستیان بەوە کردووە، هەم بێباوەڕان، کەسیشیان لە کاتی خۆیدا نەیان کردووە بە کێشە، بەتایبەت کافران و بێباوەڕان، چونکە خۆیان شارەزای زوبان و پێکهاتەی زوبانی خۆیان بوون، ئیتر ئێستا کە کۆمەڵێك خەڵکی زوبان نەزان دەرکەوتوون ئەم ڕەخنانە باس دەکەن، کێشەکە نەزانیی خۆیانە، ئەگەرنا زوبانەکە عەیبی نییە!.

***سێیەم:*** پ2، لا68، دێڕی (1) "لە سورەتی نساء ئایەتی (161)دا هاتووە: لكن الراسخون في العلم منهم والمؤمنون.... والمقيمين الصلاة والمؤتون الزكاة. ڕستەی (مقيمين الصلاه) دەبێت وەك (الراسخون)".

وەك باسمان کرد کێشەی ئەم نووسەرە نەشارەزاییە، ئەگەرنا لە زۆربەی تەفسیرەکاندا ڕوون کراوەتەوەو شتێکی شاراوە نییە کە (مقيمون الصلاة) عەتفە لە سەر (راسخون) کە دەکرێت وا بخوێندرێتەوەو کە (حسن و مالکی کوڕی دینار) وایان خوێندۆتەوە، بەڵام زۆرینەی زانایان (مقيمين الصلاة)یان خوێندووەتەوە، بەهۆی حاڵەوە، کە هیچ فەرقو جیاوازی لە واتادا دروست ناکات، کە سیبەوەیهی دەڵێت: "مقيمين لەسەر حاڵ وا خوێندراوەتەوە"[2]. بۆیە نەدەبوو نووسەر وا بزانێت هەنگی لە کلۆرە داردا دۆزیوەتەوە بیکاتە نووسینێك کە کۆمەڵێك خەڵك دەیخوێنێتەوە شارەزاییەکی ئەوتۆیان نییە لە زمانی عەرەبیدا.

## لەبارەی ئەحکامەکانەوە

***یەکەم:*** پ4، لا75، دێڕی (1-7) "...بۆ نموونە ڕۆژوو لە یەهودەوە هاتۆتە ناو ئیسلامو یەکێکە لە نەریتەکانی عەرەب... پاش کۆچکردن بۆ مەدینە.... ڕۆژوو بوو بە چەندین ڕۆژ، واتە (10) ڕۆژی سەرەتای مانگی موحەڕڕەم بەڕۆژوو دەبوون..".

سەرەتا با ئەوە ڕاست بکەینەوە کە نووسەر باسی ڕۆژوو دەکات کە گوایە لە یەهودەوە وەرگیراوە، ئەوەی شارەزاییەکی سادەی دەربارەی ئایینەکان هەبێت تێدەگات کە لە زۆر شتدا لە یەکچوونێك هەیە، تەنها جیاوازیان لە جیاوازی قۆناغەکانیانەوەیە، بەپێی پێگەیشتی بیروبۆچوونی عەقڵی کۆمەڵگاکان، هەربۆیە نوێژو ڕۆژوو زۆرێك لە عیبادەتەکان لە هەمواندا هەیە، بەڵام بەشێوەی جیاواز، ئەوەش بەڵگە نییە کە حەزرەت کاتێك چوویێتە مەدینە ئینجا دەنگو باسی ڕۆژووی زانیبێت، چونکە عەرەب لەوەوپێش ئاشنابوون بە ڕۆژوو، بەڵام ئەو ڕۆژووەی کە حەزرەت لە بارەیەوە دەپرسێ هۆکارەکەی دەبێتە ئەوەی ئەمر بفەرموویێت کە ئەوان نزیکترن بەوەی ڕۆژوو بگرن لەبری ڕۆژێك کە خودای گەورە موسای تێدا ڕزگارکردووە، ئەوەشی کە نووسەر باسی دەکات زۆرێکی وانییە، ئەوەتا کتێبەکانی سیرە باسی لێوە دەکەن، لەساڵی دووەمی کۆچی و لە مانگی شەعباندا خوای گەورە ڕۆژووی فەرزکرد بەسەر مسوڵماناندا بە ئایەتی (183، 184) سورەتی البقرە، کە باسی فەرزبوونی ڕۆژوو دەکات لەسەر ئەوان و قەومەکانی پێش ئەوان، ئەمە لە کاتێکدا ئیمامی ئەحمەد بۆمان دەگێڕێتەوە لە موعازی کوڕی جەبەلەوە دەفەرموویێت: نوێژ سێ قۆناغی بەسەرداهات و ڕۆژووش سێ قۆناغ، یەکەمیان پاش ئەوەی حەزرەت کۆچی کرد بۆ مەدینە لە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، پاشان عاشورای لە گەڵ گرت، پاشان ڕۆژوو فەرزکرا، پاشان ئایەتی (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ

---

[1] فتح القدير، محمد بن علي بن محمد الشوكاني، ص378، ج5، ط1998.

[2] فتح القدير، محمد بن علي بن محمد الشوكاني، ص619، ج1.

حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ) كۆتايی به قۆناغی سێیه‌م هات هه‌ربۆیه ئه‌وه‌ی نووسه‌ر باسی ده‌كات وانییه، به‌هه‌ڵه لێی حاڵی بووه.

***دووه‌م:*** پ2، لا76، دێڕی (1-3) "...حه‌ج به‌پێی لێكۆڵینه‌وه‌كان له‌ پێناو پاڵپشتی كردن‌و سه‌قامگیربوونی ڕه‌وشی قه‌ومیی عه‌ره‌ب دانراوه، هه‌موو ڕێ‌و ڕه‌سمه‌كان، حه‌ج، عه‌مره، احرام، الثم و..".

سه‌ره‌تا (الثم) نییه (اللثم) واته ده‌ستدان له‌ به‌رده‌ڕه‌ش‌و هاتوچۆی نێوان سه‌فاو مه‌ڕوا، پاشان ئه‌و لێكۆڵینه‌وانه كامانه‌ن‌و كامیان بێلایه‌نه‌و له‌ ئه‌نجامی چیدا ئه‌م لێكۆڵینه‌وانه‌كراون؟! هه‌ركه‌سێكی خاوه‌ن عه‌قڵ‌و ژیری، جا دیندار بێت، یان بێدین، ده‌زانێت كه‌ حه‌ج كۆنگره‌یه‌كی ساڵانه‌یه‌و یه‌كه‌م كه‌س كه‌ بناغه‌ی داناوه عه‌ره‌ب نییه‌و له‌ سه‌ره‌تایشدا ناوچه‌كه ئاوه‌دان نه‌بووه تا ببێت به‌ پشتیوانی بۆ عه‌ره‌ب، ئه‌وه ماوه‌ته‌وه بڵێین كۆنگره‌یه‌كی سیاسیی عیبادیه‌ بۆ ئاگالێبوونی مسوڵمانانی جیهان له‌ حاڵی یه‌كتری‌و ئاگابوونی مه‌ركه‌زی خه‌لافه‌تی ئیسلامیی له‌ سه‌رجه‌م مسوڵمانانی جیهان، شانده‌كانی حه‌ج بۆ به‌سه‌ر كردنه‌وه‌ی خه‌لیفه‌و داواكاریه‌كانیان ڕوویان له‌ حه‌ج كردووه، پاشان به‌شێكه له‌ مه‌راسیمی عیبادیی ڕۆژی دوایی كه‌ هه‌ركه‌سێكی ساده ڕووی تێده‌كات تێده‌گات، وه‌ك به‌شێك له‌ قیامه‌ت وه‌هایه، كه‌ جۆرێك له‌ ته‌بایی بۆ دروست ده‌بێت كه‌ خۆی به‌به‌شێك له‌ مسوڵمانانی جیهان ده‌زانێت‌و مسوڵمانانی جیهان به‌ پشت‌و په‌نای خۆی، ده‌كرێت ئه‌وه به‌یێنینه‌وه یاد كه‌ ده‌كرێت مه‌سه‌له‌ی بازرگانی له‌ كاتی حه‌جدا ڕه‌چاوبكرێت، حاجی به‌ ته‌نها بۆفه‌رزی حه‌ج ناڕوات، به‌ڵكو ده‌توانێت كاڵاو كه‌ل‌و په‌لی وڵاتی خۆی ببات بۆ وڵاتی حیجازو كڕین‌و فرۆشتنی پێوه بكات، له‌ئێستاشدا ده‌توانێت سوود له‌ زانیاری هه‌ردوولا وه‌ربگیرێت، بۆ گوێزانه‌وه‌ی شاره‌زایی له‌بواره‌ جۆربه‌جۆره‌كاندا.

## موحه‌مه‌د مرۆڤه

***یه‌كه‌م:*** پ3، لا83، دێڕی (1) "...له‌ ئایه‌تی (55)ی سوره‌تی غافردا ده‌ڵێت (فأصبر أن وعد الله حق، واستغفر لذنبك وسبح بحمد ربك بالعشي والابكار).. ڕوو له‌ خودا بكه‌و نوێژی پێنج فه‌رزه به‌جێ بهێنه".

له‌ پ5، لا75 دێڕی (4) نووسه‌ر ده‌ڵێت "...ئه‌گینا قورئان ئاگای له‌ وردو درشتی نوێژ نییه"، ئه‌ی تۆی نووسه‌ر ئه‌مه‌ت چۆن له‌ ته‌فسیری قورئان وه‌رگرت، له‌ كاتێكدا ئایه‌ته‌كه به‌ڕاشكاوی باسی نوێژ ناكات، ئه‌كرێت ئیشاره‌تێكی تێدابێت كه‌ ته‌نها باسی دوو نوێژی لێوه‌رده‌گیرێت، ئه‌ویش نوێژی به‌یانی‌و عیشایه، هه‌ربۆیه ئه‌م نووسه‌ره له‌ هه‌ر كوێدا ئاره‌زووی لێبێت ته‌فسیر ده‌كات به‌مه‌یلی خۆی.[2]

### تێبینییه‌ك:

زۆرجار نووسه‌ر، یان وه‌رگێڕ شتێك نه‌قڵ ده‌كه‌ن كه‌ نازانم هه‌ڵه‌ی چاپه، یان نه‌شاره‌زاییه، بۆیه لێره ئاگادارتان ده‌كه‌ین له‌ سه‌ریان:

1. له‌ پ1، لا87، دێڕی (12) "له‌ شه‌ڕی (بئر معونه) كه‌ (70) كه‌س له‌ مسوڵمانان كوژران.
ڕاستەكەی (بئر معونه)یه‌و (69) له‌ هاوه‌ڵان شه‌هید بوون.
2. له‌ پ1، لا88، دێڕی (1) "له‌تایفه‌ی (بحیره)..".
ڕاستەكەی "هۆزی (عكل‌و عدینه)، نه‌ك بحیره، ئه‌و ڕووداوه مه‌شهووره به‌ڕووداوی (عوره‌نیین)"
3. له‌ پ2، لا91، دێڕی (2) "ئه‌فسانه نووسی تری وه‌ك (قسطلاني).."
ڕاستەكەی (قسطلاني)یه.
4. له‌ پ1، لا104، دێڕی (6) (زه‌یدی كوڕی حاری).
ڕاستەكەی (زیدی كوڕی حارثة)یه.

---

[1] البداية والنهاية، لابن كثير ص269-270، ج2. السيرة النبوية، د. علي محمد محمود الصلابي ج1، ص669.

[2] تفسير القرآن العظيم، ابن كثير ص115،ج3.

**دووەم:** پ2، لا92، دێڕی (2) "...باشتر نەبوو کە قورئانی بەدەستی خۆی بنووسیایە، تا یەهوودیەك بۆ نووسینەوەی قورئان بەکرێ نەگرن؟".

لەسەرەتاوە باسم کرد کە باوەڕکردن بەم نووسەرە، یان بەدرۆخستنەوەی کارێکی زۆری دەوێت، چونکە کە باسێك دەکات نموونە نادات، خۆ ئەگەر نموونەش باس بکات سەرچاوەکەی بەشێوەیەك دەڵێت کە ناتوانیت بۆی بگەڕێیتەوە، ئەم پەرەگرافە یەکێکە لەو شوێنانە، زۆر گەڕام تا بزانم ئەم کابرا یەهودیە کێیە؟ پاش گەڕانم لە چوار سەرچاوە دۆزیمەوە کە ئەو کەسە ناسراوە بە (عبدالله بن سعد بن أبي سرح) لە بەنی عامری بن لوئەیە کە عەرەبەو یەهودی نییەو برای شیری ئیمامی عوسمانەو یەکێکە لە وانەی کە پاشگەزبوونەوە لە ئیسلامو نووسەری وەحی بووە، حەزرەت لە ئازادکردنی مەککەدا فەرمانی دابوو کە یەکێك بێت لە کوژراوەکان، بەڵام ئیمامی عوسمان پەنای داو پاشان حەزرەت لێی خۆش بوو، لە دواییدا مسوڵمان بوو، ئیمامی عومەر لە سەردەمی خۆیدا کردی بە کاربەدەستو پاشانیش ئیمامی عوسمان هەندێ کاری پێسپارد، لە سەردەمی خۆیداو بە مسوڵمانیەتی مردووە[1]، لە کاتێکدا مرد کە سەری لە سوجدەدا بوو لە نوێژی بەیانیدا .

ئەوانەشی کە قورئانیان کۆکردووەتەوە لە سەردەمی حەزرەتدا چوارکەس بوون کە هیچیان جولەکە نەبوون، ئەوانیش (أبی بن كعب، معاذ بن جبل، زيد بن ثابت، أبو زيد)[2].

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم نووسەرە خۆشی نازانێت دەڵێ چی، پێغەمبەرێك کە نەخوێندەوار بێتو خودی نووسەر لە پ2، لا79 دێڕی (3) باسی لێوە دەکات دەبێت چۆن بینووسێت، پاشان تەنها (عبدالله بن سعد) نووسەری وەحی نەبووە.

ئەوەشی کە باسی کرێ دەکات، هاوەڵانی حەزرەت خۆی دەکردە قوربانیی بۆ ئاین، دەکرێت بوترێت بەکرێ قورئان بنووسن، نووسەر لەبەر دووچاربوونی بەنەخۆشی شیزوفرینیا نازانێت چۆن درۆکان بکات، ئەوەتا لە شوێنێك دەڵێت: "نەخوێندەوارە"، لە شوێنێکی تردا دەڵێت "باخۆی بینووسیایە".

## کەسایەتی نوێی موحەممەد

نووسەر لەم چەند پەرەگرافەداو لە ژێر ئەم سەردێڕەدا کۆمەڵە لێکدانەوەو کۆمەڵە ئایەتێکی هێناوە کە گوایە حەزرەت لە دوای هیجرەت گۆڕاوەو لەباتی ئەو نەرمو نیانییەی کە پێشتر هەیبوو ئێستا توندو تیژ بووە شمشێرو وشەی کوشتن جێگەی وتە نەرمەکانی گرتووەتەوە، سەیرو سەمەرە لەوەدایە کە ئەم نووسەرە باس لە مێژوو دەکات، بەڵام شارەزایی لە مێژووی جیهان نەبووە، بەتایبەت بزاڤی ئایینی، بەتایبەتتر ئەم ئایینە تازەیە کە ماوەی (13) ساڵ لە مەککە بەبەردەوامی هەوڵو کۆششی شەوو ڕۆژی ئەوەبوو کە خەڵك هیدایەت بکات، بەمەبەستی هێورکردنەوە سێ جار ساحەی چۆڵ کردووە، بەڵکو بەخۆیاندا بێنەوە، تا سەرەنجام دەریان دەکەنو ماڵو موڵکیان دەست بەسەردا دەگرن، وەك ئەوەی لەگەڵ سوهەیبی ڕۆمیدا ڕوویدا، هەربۆیە پارێزەرانی ئیمان هەوڵ دەدەن ئیمانەکەیان بپارێزن، بۆیە خوای باڵادەست ڕێگەیان پێدەدات کە بەرگری لە ئایینەکەیان بکەنو بەرامبەر چی بەکاردەهێنێت، ئەمانیش بۆیان هەیە ئەوە بەکاربهێنن، لەوەش سەیرتر ئەوەیە بۆ خەڵکی دژ بە دینو ئاینو ڕەوشت ڕەوایەو حەڵاڵە کە هەرچی لە دەست بێت درێغی نەکات، بەڵام بۆ خاوەن بڕوا حەرامە، گەر لە کاتی سەرەمەرگیدا بێت هاوارو پەلەفرتەش بکات، بۆیە لە زووووە جەلادەکان نیگەرانن نێچیرەکانیان پەلە فرتە بکەنو نیگەرانن لەوەی مسوڵمان هێزی هەبێتو بەرگری لە خۆیو ئایینەکەی بکات. لەمانەش سەیرتر ئەوەیە نووسەر ئایەتێکی هێناوەو لە ڕووداوێکی مەککەدا نازڵ بووە، کە چی بەکەیفی خۆی مانای دەکاتو تەحلیلی بۆ دەکات ئەویش: پ7، لا113ی سورەتی التوبه (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ) واتە پێغەمبەرو مسوڵمانان سازش لە گەڵ کافرلندا ناکەنو نایانبەخشن.

لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتاوە باسی چۆنییەتی تەفسیرو تەفسیرکردنمان باسکرد نامەوێت دووبارەی بکەمەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە ئیمامی ئەحمەد دەیگێڕێتەوە کە ، ئەبوتالیب مامی حەزرەت لە

[1] السيرة النبوية لابن هسام، ج4، ص409.

[2] تيسير الكريم المنان في سيرة عثمان بن عفان، د. علي محمد محمد الصلابي ص248.

سەرەمەرگدا بوو حەزرەت زۆر هەوڵی دەدا کە وشەی (لااله الا الله) بڵێت تا ڕۆژی دوایی شەفاعەتی بۆ بکات، بەڵام ئەبوجەهل و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئومەیەی لابوون هەوڵی ئەوەیان دەدا کە لەسەر ئایینی کۆن بمێنێتەوە، هەر بۆیە حەزرەت فەرمووی (لأستغرن لك مالم إنه عنك) داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم مەگەر خودای گەورە ڕێگەم پێنەدات، پاشان ئایەتی (113) هاتە خوارەوە کە نابێت پێغەمبەرو مسوڵمانان داوای لێخۆش بوون بکەن بۆ موشریکەکان با کەسی نزیکیان بن، پاش ئەوەی بۆیان دەردەکەوێت کە شایانن بەدۆزەخ، لە لایەکی‌تر ئەوەی بە ئەندازەیەکی کەم شارەزایی زمانی عەرەبی بێت دەزانێت هەر کردارێك (أ، س، ت)ی چووە سەر ماناکەی دەگۆڕێت بۆ داواکاری کردن، واتە ئەگەر (غفر) بە واتای (لێی خۆش بوو)، بێت، ئەوا (استغفر) بەواتای داوای لێخۆشبوون دێت، هەربۆیە بەهیچ شێوەیەك مانای سازشی تێدا نییەو پەیوەندی بە لێخۆشبوونی ئەمانەوە نییە، تەنها مەبەست لێی لەم ئایەتەدا ڕۆژی دواییە [1].

لەلایەکی‌تر سەبارەت بەم ئایەتە ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێت: "سەبارەت بە پێغەمبەر (ﷺ) هاتۆتەخوار کە داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ دایکی، پاش ئەوەی ڕۆژێك چووە سەر گۆڕەکەی" کە مەبەست لە هەردوو ڕاڤەکە ئەوەیە کە نابێت داوای لێخۆشبوون بکرێت بۆ مردوویەك کە دڵنیا بیت لە کافریەتی ئەو مردووە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی ڕاست‌و دروستدا هاتووە حەزرەت دوای ئەوەی لە جەنگی ئوحوددا دانیکی دەکەوێت، دوعای خێر دەکات بۆ هۆزەکەی، بەڵام خوای گەورە ئەم ئایەتە دەنێرێتە خوارەوە کە نابێت داوای لێخۆشبوون بۆ کافران بکەیت [2].

## کەمینی پوشە خورما

پ2، لا(117)، دێڕی (3.1) "شەڕەکانی ئیسلام (غزوة) لێرەوە دەستی پێکرد، غەزو واتە هێرشێکی کوتوپڕو لە ناکاو بۆ سەر عەشیرەتێك، یان کاروانێك‌و زەوتکردنی ماڵ‌و ژنەکانیان" لە پ3، لا117 (...هەواڵ گەیشتە موحەممەد کە کاروانێکی قورەیش بەسەرپەرشتی (عەمری کوڕی خضرمي)...".

وەك باسمان کرد کە ئەم نووسەرە ڕاڤەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئایەتەکان، بەهەمان شێوە لێکدانەوەی تایبەتیشی هەیە بۆ وشەکان، ئەوەتا غەزو وا پێناسە دەکات، کە لە ڕاستیدا غەزاو لە زمانی عەرەبیدا واتە (بەرەو ڕووی چوو، یان بەدوایدا گەڕا)، غزاه واتە (بەرەو شەڕکردنیان ڕۆیشت بۆ جێگەی خۆیان، تا دەست بگرێت بەسەر سەروەت‌و سامانیاندا)[3]، نەك هێرشێکی کوت‌وپڕ. لە لایەکی دیکە لە ژێر ناونیشانی کەمینی پوشە خورمادا باسی دەکات، کەمین واتە خۆمەڵاسدان بۆ کە سێك، یان کۆمەڵە کەسێك تا دەکەونە بۆسەیەکەوە کە دانراوە، کە لەگەڵ باسەکەدا زۆر نەگونجاوە، ئەوەش ڕوون بکەینەوە ئەم ڕووداوەی کە نووسەر باسی دەکات بە سریە بەناوبانگە، نەك غەزو، چونکە غەزوە بەڕووداوێك دەڵێن کە کۆمەڵە مسوڵمانێك لەگەڵ حەزرەت دەرچووبن دووچاری شەڕهاتبن یان نا، بەڵام سریە بەو کۆمەڵە مسوڵمانە دەوترێت کە حەزرەت ناردوونی [4].

پاشان لە ڕێگەی هەواڵەوە نەبوو، بەڵکو ئەم کۆمەڵە بۆ کارێکی هەواڵگریی دەرچووبوون سەبارەت بە دەنگ‌و باسی قورەیش، کە یەکەم سریە بوو کوشتاری تێدا ڕوویدات لە گەڵ دیل گرتندا.

سەبارەت بەوەی کە نووسەر دەڵێت "...شەڕەکانی ئیسلام (غزوە) لێرەوە دەست پێدەکات" وانییەو دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە پێش ئەم سریەیە (7) غەزوەو سریە بەدوای دوژمندا دەرچوون، یەکەم غەزوەیان لە مانگی (صفر)ی ساڵی دووی کۆچی دەستی پێکرد، سریەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش، لە کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەجەبی هەمان ساڵ ڕوویدا.

[1] تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، ج2، ص571.
[2] فتح القدير، الشوكاني، ج2، ص466.
[3] المنجد في اللغة، ص550، لويس معلوف، ط35.
[4] السيرة النبوية، د. علي محمد محمد الصلابي، ص631، ج1.

## قەڵاچۆکردنی جولەکەکانی مەدینە

پ5، لا123، دێڕی (1) "....لەناو ئەوانەدا بە پێچەوانەی فەرمانی سەعد کە وتبووی ژنەکانیان بکەن بە کۆیلە لە ملی ژنێکیان دا کە ژنی (حسن قريظي) بوو کە تا کاتی مردنەکەی لای عائیشە بوو".

بەڵێ بڕیاری سەعدی کوڕی معاز ئەوە بوو لە ملی پیاوەکانیان بدرێ‌و ژنەکانیشیان بکرێن بە کۆیلە، کە جەنگ ئەوکاتە، بەو شێوەیە دەکرا، زیندانیی نەبوو، لە گەڵ ئەوەشدا ژن بەشداری شەڕی دەکرد، ئەگەر مسوڵمانیش دەگیرا، یان دەکوژرا، یان دەکرایە کۆیلە.

هەربۆیە بڕیاری سەعد لە کاتی خۆیدا لە عورفی جەنگی ئەوکاتە دەرناچێت، سەبارەت بەو ئافرەتەی کە لە ملی درا: عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو ئافرەتە لای من دانیشتبوو، کاتێك ئەویان بانگ کرد، منیش پێموت تۆیان بۆچیە؟، لە وەڵامدا وتی: بۆ کوشتن، لێم پرسی، بۆچی، وتی چونکە ڕووداوێکم لە دەست ڕوویداوە، ئەوەبوو بەردێکی گەورەم لە سەربانەوە دا بەسەری خلادی کوڕی سوەیددا کوشتم، پاشان لە بەر ئەم قەتلە بوو کە کوشتیان، ئەگەر نا جگە لەم ئافرەتە بکوژە، کەسی‌تر نەکوژراوە .

## هەنگاونان بەرەو دەسەڵات

***یەکەم:*** پ1، لا125 "... بیانەوێت‌و نەیانەوێت دین‌و ئاینی نوێیان بەسەردا بسەپێنێت".

پ2، لا130 "....ئایا ناچارکردنی خەڵك بۆ قەبوڵکردنی بیرو باوەڕو ئاینێتر بەزەبرو زۆری شمشێر کارێکی پەسەندەو لەگەڵ بنەمای بەرزی عەدالەت‌و ئینسانیەتدا دەگونجێت".

پ1، لا132 "(وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ) واتە جگە لە ئیسلام هیچ دینێکی تر قبوڵ ناکرێت (سورەتی آل عمران 85)".

ئەوەی سەیری ئەم سێ پەرەگرافە بکات‌و ئیسلام لەم ڕێگەوە بناسێت بەتەواوی بێزار دەبێت لە ئیسلام، هەرگیز خوازیار نابێت کەئاینێکی لەو جۆرە لە وڵاتی ئەودا شوێن پێی هەبێت، بەڵام ئەوەی بەدوای ڕاستی‌و دروستی ئەم ئاینەو مێژووی مامەڵەی ئەم ئاینەدا بگەڕێت بۆی دەردەکەوێت ئەمانەی سەرەوە بوختانێکی ناڕەواو ستەمکارانەن.

سەبارەت بە ئیسلام‌و مێژووەکەی: چونکە هەم لە ڕوانگەی دەقە قورئانییەکانەوە کە لە چەند جێگا دەبینرێت کە (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ) و(مَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ) (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ) (لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ). بە تەواوی ڕوون دەبێتەوە، هیچ دەقێکی قورئانیی باسی فشارو زۆرەملێی ئایین سەپاندن ناکات، وەك نووسەر ئیدیعا دەکات، خۆ ئەگەر بێینە سەر مێژووی ئیسلام‌و مامەڵەی لەگەڵ بێباوەڕاندا، بۆمان دەردەکەوێت ئەگەر مامەڵەی بەرامبەر لە کافرێکی موسالیمەوە نەگۆڕابێت بۆ کافرێکی جەنگاوەر ئیسلام لەگەڵیدا نەجەنگاوە، خەڵکانێك هەبوون بەدرێژایی ژیانیان لە دژی ئیسلام بوون، ئەوەتا (هبیرەی کوڕی ئەبی وەهبی مەخزومی) کە لە جەنگی بەدردا بەشداریی کردووە[1]، پاشانیش لە گەڵ عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل لە جەنگی خەندەق بەشداریی دەکات، هاوسەری ئوم هانیە کە لە فەتحی مەککەدا دوو کافری پەنادابوو، ئەم پیاوە شاعیرێکی بەناوبانگی عەرەبەو تەنها ئەوو (ابن الزبعري) مابوون، مایەوە هەتا بەکافری لە مەککەدا لە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامدا بە کافری ژیاو کەس دەستی بۆ نەبرد، جگە لەمانە ئەو هەموو جولەکەو نەسرانیە کە لەو ناوچەیەدا بوون هەر هەموویان لە سەر ئایینی خۆیان مانەوەو کەسیان لەسەر دیانەتەکەیان لێی نەکوژرا، سەبارەت بەو ئایەتەش کە نووسەر هێناویەتیەوە بۆ ڕاوکردنی نێچیرێکی نەخۆش، زۆر ئاشکرا دیارە کە ئایەتەکە باسی دواڕۆژ دەکات، خۆ ئەوەی شارەزاییەکی کەمی عەرەبیی هەبێت تێدەگات کە ئەو ئایەتە مەبەست پێی لە دوا ڕۆژدا جگە لە ئیسلام هیچ دینێکی دیکە جێگەی قەبوڵ نییە، هەروەك ئایەتەکە لە کۆتاییدا دەفەرمووێت (وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ)، بەڵام نووسەر بە مەبەست کۆتاییەکەی

[1] السيرة النبوية، ابن هشام، ج3، ص34-224-411.

نەنووسیوە بۆ تەشویش دروستکردن، پاشان دەبوایە نووسەر چەند بەڵگەو نیشانەیەکی بهێنایەتەوە بۆ ڕاستیو دروستی قسەکانی، یاخود ڕوونتر لەمانە، ئیسلام پێش هەموو ڕووبەڕووبوونەوەیەك بانگەوازی ئەو گەلە، ئەو هۆزەی کردووە، پاشان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەشدا بەمەرجی داناوە کە هەر کەسێ مسوڵمان بێت ئەوا هەمان ئەرك و مافی مسوڵمانانی دەبێت، ئەگەر شەڕ دەکات با بیکات، ئەگەر لە سەر ئاینی خۆی دەمێنێتەوە با بمێنێتەوە، کە ئەرکی لەسەر نییەو مافی خۆی هەیە، تەنها ئەرکێك کە هەیەتی باجێکە دەیدات، لە بری پاراستنی گیان و سامان و ماڵی لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا.

ئەو باجەش کە دراوە پارەیەك بووە لە باتی خزمەتی سەربازیی (بدل الخدمة العسكرية)، کە بێگومان ئێستاش لە وڵاتانی دنیادا کاری پێدەکرێت، هەربۆیە دواتر ئەگەر یەکێك ئامادەبووبێت لە سوپای ئیسلامدا خزمەت بکات باجی لەسەر لابراوە.

<u>***دووەم:***</u> پ4، لا125، دێڕی (1-3) "...ئایەتەکانی مەککی نیشانەی هاتنی ئاینێکی نوێ نییە".

پ3، لا126، دێڕی (1) "(جعبری) دەڵێت: هەر سورەتێك کە ئەرکێکی ئاینیی تێدایە ئەوە لە سورەتە مەدەنییەکانە".

پ2، لا127، دێڕی (1-6) "...حوکمەکانی لە مەڕ تەڵاق و مارەبڕین چلەو میراتیی و بێنوێژیی و فرەژنەو سزای زیناو دزی...".

لەم باسانەدا چەند پەرەگرافێك لەبەرکورتی وەڵامەکانیان و نزیکی ڕەخنەکان هەوڵ دەدەم بەیەکەوە وەڵامیان بدەمەوە، بۆ ئەوەی باسەکە درێژە نەکێشێ، سەرەتا سەرجەم پیاوانی قوڕەیش یەکدەنگ بوون کە ئەوەی موحەممەد (ﷺ) هێناویەتی دینێکی تازەیەو جیاوازە لەو دینانەی کە لەوەو پێش هەبوون، خۆ ئەگەر جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبووە بۆچی بەو توندیە دژایەتی کراوە؟، هەر لە خوداپەرستییەوە بگرە تا نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و حەجکردن و زەکاتدان و جیهادکردن و سەرجەم پرەنسیپە سەرەکییەکانی ئیسلام، لەوەو پێش، یان نەبوون، یان زۆر جیاواز لە ناو قوڕەیشدا بینراون، چونکە ئەو هەموو ئایەتەی لەبارەی دامەزراندنی بیروباوەڕی تاکەوە هاتۆتە خوارەوە، ئەگەر ئایین و دینێکی تازە نەبێت بەچەند ئایەتێك شتە هەڵەکان ڕاست دەکرایەوەو کۆتایی پێدەهات و حەزرەتیش ئەوەندە دووچاری نارەحەتی نەدەبوو، پێی دەوتن ئەمە هەر دینەکەی خۆتانەو کەمێك دەستکاریی کراوە، بەڵام ئەوەی شارەزای مێژووی ئاینەکان بێت دەزانێت کە ئەم ئایینە سەرجەم بیروباوەڕەکانی پێش خۆی لە بنچینەوە هەڵتەکاندووە، ئەوەتا خودی نووسەر باس لە ئایینێکی نوێ و شەریعەتێکی تازە دەکات.

لە پ6، لا127، دێڕی (1-2) "... کەسێك کە ئایینێکی نوێ و شەریعەتێکی تازەی هێناوەو سەرتاپا بیروباوەڕو خورافاتی قەومەکەی خۆی فڕێداوە.."

سەبارەت بەو قسەیەی (جعبری) کە زۆر گەڕام بزانم کێیە بەدەستم نەکەوت، گومانم لە ناوەکەی هەبوو کە وەرگێڕ لێی تێکچووەو هیچ نیشانەیەك نەبوو لە کوێدا ئەم قسەیەی کردووە، تابزانم چۆن کردوویەتی، چونکە قسەکەی بەو ڕەهاییە زۆر هەڵەیە، چونکە زۆرینەی سورەتەکانی قورئان ئەرکی ئایینیان تێدایەو مەدەنی نین، لەوانە:

ئایەتەکانی باوەڕهێنان و فەرزبوونی نوێژ لە ئایەتە مەککیەکان و لە مەککەشدا فەرز بوون، هەروەها ئایەتی (وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَاداً كَبِيراً) کە باس لە جیهاد دەکات و ئایەتێکە مەککیە.

سەبارەت بە حوکمەکانیتر کە لە ناویاندا (چلە) هاتووە، نووسەر قیاسی خراپ دەکات و وا دەزانێت هەمووومان لە سەر مەزهەبی جەعفەرین و شیعەین!! چونکە مەسەلەی چلە وەك عورفێك لە ناو شیعەدا هەیە، ئەگەرنا تەحەددای نووسەرو وەرگێڕیش دەکەم کە نەیتوانیوە ڕوونکردنەوەی خۆی بدات لەو شتانەی کە وانییەو جێگەی تێبینییە، تەحەددای هەردووکیان دەکەم کە بابەتی چلە لە هیچ کوێی ئایینی ئیسلامدا هەبێت، وەك حوکمێکی شەرعی، خۆ ئەگەر مەسەلەکە عورفێکی ناوچەیی بێت مامەڵەی وەك بابەتێکی ئایینی لەگەڵ کرابێت، ئەوە کێشەی ئیسلام نییەو ئیسلام وەك ئاین ناچێتە ژێر ئەرکییەوە، ئەگەر ئەو حوکمانە لە یەهودەوە وەرگیراون، بۆچی یەهود ئەوەندە دژایەتی ئیسلامیان کردووە،

لە کاتێکدا شتە وێکچووەکانیان ئەوەندە زۆرن؟ لە لایەکی دیکە بۆچی لە هیچ کەسێکی یەهودیەوە ئەمە نەبیسترا، جگە لە نووسەرێکی یەهود فیکری وەك تۆوە، ئەمەیە کە خۆت واتەنی (کاسە لە چێشت گەرمترە).

*__سێیەم:__* پ1، لا126، دێڕی (1) "لەمەککەدا تەنها پێنج ڕیشەیی دانرابوو:

1. باوەڕهێنان.
2. نوێژکردن.
3. ڕۆژوو .
4. زەکات.
5. حەج.

نووسەر لەمەشدا بەهەڵەدا چووە، چونکە ئەو پێنج شتە سەرەکیە تەنها دوانیان لە مەککە فەرزکران، ئەویش (باوەڕهێنانو نوێژکردن) بوون، هەرچەندە قسەیەکی (جعبری) نەقڵ دەکاتو دەڵێت: "هەرسورەتێك ئەرکی تێدا بێت ئەوە مەدەنییە، بەڵام لێرەدا ئەم پێنج ئەرکە مەککین!.

جانازانم چۆن تەوفیق دەخاتە نێوان قسەکانی، هەرچی ڕۆژووە لە ساڵی دووەمی کۆچیو لە مانگی ڕەمەزاندا واجب بووە، هەندێك دەڵێن لە شەعباندا[1]، سەبارەت بە زەکات، زۆربەی زۆری زانایان لە سەر ئەوەن لە دوای هیجرەت واجب بووە[2]، ئەوەیش کە پەیوەندی بەحەجەوەیە ساڵی شەشەمی کۆچی فەرزبووەو هەر لەو ساڵە ئایەتی (وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ)[3] دابەزی .

هەرچەندە نووسەر لە دوای چەند پەڕەیەك، واتە لە پ4، لا 129 لە دێڕی3 دەڵێ "...لەمەدینەدا زەکات لە حاڵەتی خێرو خێراتی سەرپشکەوە بەشێوەی باجی لێهات".

## کوشتنی دوو دیل

نووسەر لە ژێر ئەم سەردێڕەدا باسی کوشتنی دوو دیلی جەنگی بەدر دەکاتو باسی لێخۆشبوونی حەزرەت دەکات لە قورەیشو فەرمانی کوشتنی چەند کە سێکی تری دەرکرد، باسەکان بەمشێوەیەیە:

1. عقبەی کوڕی معیط لە دیلەکانی شەڕی بەدربوو، عاسمی کوڕی سابتیان کردە جێبەجێکەری کوشتنی عقبە.
2. نضری کوڕی حارس لە دیلەکانی شەڕی بەدر بوو، لە ڕاستیدا (نضر) دیلی مقداد بوو، میقدادیش تەماعی خوێنایی بەرچاوی گرتبوو، لەم ڕووەوە بە پێغەمبەری گوت: ئەمە دیلی منەو بەشێك لە دەستکەوتم بەردەکەوێتو لە وەدەچێت بیرت چووبێت کە ئەم ناپاکە لە بارەی قورئانەوە چی گوت؟ (قد سمعنا لو نشاء لقلنا مثل هذا..) مقداد شمشێری هەڵکێشاو لە ملی (نضر) یاندا.
3. پ3، لا134، دێڕی ..) "...بەگرتنی شاری مەککە لێبوردنی گشتیی دەرکرا، بەڵام پێغەمبەر چەند کەسێکی جیاکردەوەو فەرمانیدا لە هەر جێگایەك دۆزیتانەوە بیانکوژن، تەنانەت ئەگەر پەنایان بردێتە بەر کەعبەش، ئەمانە بریتی بوون لە صفوان بن أمیه، عبدالله بن خطل، مقبس بن سباب، وعکرمه بن أبو جهل، حویرس بن نفیذ، شەشەم کە س عبدالله بن سعد..، دووکەسی تر بەناوەکانی (فرتنا)و (قریبه) لەبەرئەوەی چەند بەیتو دێڕێکی گاڵتەجاڕیان لەبارەی پێغەمبەرەوە

[1] نیل الاوطار، الشوکاني، ج4، ص186.
[2] نیل الاوطار، الشوکاني، ج4، ص114.
[3] نیل الاوطار، الشوکاني، ج5، ص280.

بڵاوکردبووەوە کوشتنیان، هەروەها دوو ژنیتر بەناوەکانی (هیندی کچی عتبەو سارەی کچی عمروی کوڕی هاشم لە تایفەی، عبدالمطلب، لە بەرئەوەی لە مەککە ئازاریان دابوو کوشتیانن).

سەبارەت بەم خاڵانەی سەرەوە چەند سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو گەڕام کە سەبارەت بە-عوقبەی کوڕی ابی معیط نووسەر لێرەدا بەهەڵە ناوی کردووە بە عقبەی کوڕی معیط- حەزرەت لە کاتی گەڕانەوەی لە جەنگی بەدر فەرمانیدا بەکوشتنی (عقبە)، لە کاتێکدا گەیشتنە (صفراء) کە دۆڵێکی چڕە لە دارخورماو کشتوکاڵ، کاتێك عوقبە ئەمەی بیست هاواری کرد، "بۆ دەمکوژن ئەی هۆزی قورەیش ئەوەی کە لێرەن"، حەزرەت فەرمووی "لەبەر دوژمنایەتیت لە دژی خواو پێغەمبەری خوا، عاصمی کوڕی سابت هێنایی و دای لە ملی"[1].

سەبارەت بە نضری کوڕی حارث، یەکێك بوو لە کەسە خراپەکانی قورەیش و لەوانە بوو کە زۆر ئازاری حەزرەتی دەدا، دوژمنایەتی سەختی دەکرد، سەفەری حیرەی کردبوو، لەوێ فێری حیکایەتی پاشاکانی فارس بوو بوو لەگەڵ حیکایەتی ڕۆستەم و ئەسفەندیار، لە هەر شوێنێك حەزرەت دابنیشتایەو باسی ئایینی بۆ خەڵکەکەی بکردایە، نضر لە دوای ئەو دەڕۆیشتە ئەو شوێنەو دەیوت قسەکانی من لە قسەکانی موحەممەد باشترن، وەرن بۆلای من، ئەمە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە دەیوت: "دەتوانین وەك موحەممەد قورئان بڵێین و لەویش باشتر"، حەزرەت ئەمری کرد بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەویش فەرمانی کوشتنی جێبەجێکرد[2]، بەڵام نووسەر باس لە مقداد دەکات، کە گوایە دیلی مقداد بوویێت و بەتەمای دەستکەوت بێت و پەرەگرافێکی ناتەواو نەقڵ دەکات، هەندێکی وەك قسەی مقداد نەقڵ دەکات، کە ئاراستەی حەزرەتی کردبێت، پاشان مقداد نضری کوشتبێت، کە وانییەو ئەوە سەرچاوەی مێژووا!.

سەبارەت بە خاڵی سێیەم، پاش بەراوردکردنی ناوەکان کە نووسەر باسی (دە) نەفەر دەکات تەنها (9) کەسیان دەستکەوت کە تەنها (4) کەسیان کوژران، ئەوانیش (عبدالله بن خطل، مقیس بن سباب، حویرث بن نفیذ، قریبە (گۆرانی بێژی ئافرەت)) ئەوانی تریان ئازادکران و مسوڵمان بوون، تەنها (صفوان بن أمیە) لە سەرجەم سەرچاوەکاندا ناوی نەهاتبوو[3].

هەرچەند هەندێ ناویتر هەبوون، لەوانە (حارث بن طلاطل الخزائی، کعب بن زهر، وحشي بن حرب)[4].

## کوشتارە سیاسییەکان

***یەکەم:*** پ1، لا136، دێری (1-11) "کەعبی کوڕی ئەشرەف لە یەهودییەکانی (بنی نظیر)- نووسەر، یا وەرگێڕ ئەم وشەیەی بەهەڵەی ئیملائی وا نووسیوە، ئەگەرنا ڕاستییەکەی (نضیر)ە، وا دەنووسرێت-، بوو لە دوای شەڕی (بدر) لە فراوانبوونی نفوزو دەسەڵاتی محمد نیگەران دەبێت و دەچێت بۆ مەککە، هاودەردیی خۆی لەگەڵ قورەیش دەردەبڕێت، بۆ شەڕ لە دژی محمد هانیان دەدات، پاش گەڕانەوەی بۆ مەدینە، بەشێوەی خۆی کەوتە دڵداری و ڕابواردن لەگەڵ ژنانی مسوڵمانان، پێغەمبەر ئەمەی کردە بیانوو گوتی (من لي بابن الاشرف... محمد کوڕی موسلیم هەستاو وتی: من...)".

کەعبی کوڕی ئەشرەف لە یەهودییەکانی بەنی نیهانەو لە قەبیلەی طي و (نووسەر بەهەڵە وتویەتی سەربە بەنی نظیرة)، باوکی بەهۆی دوژمندارییەوە هاتووە بۆ مەدینەو لەگەڵ هۆزی بەنی نضیر هاوپەیمان بووە، کەسێکی شاعیر بوو، زۆر قسەی ناشیرینی ئاڕاستەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد[5]، بەپێی قسەکانی نووسەر کە ئاماژەی پێکراوەو هەروەها سەرجەم سەرچاوە مێژووییەکان، لە دوای جەنگی بەدر، دەچێتە مەککەو هەوڵی توندکردنەوەی قورەیش دەدات بۆ شەڕکردن لە دژی مسوڵمانان، بەم کردەوەی ئەو پەیمانەی لە نێوان پێغەمبەردایە وەك سەرۆکی دەسەڵات و هەرسێ تایفەی یەهود، هەڵدەوەشێتەوەو بەمە خیانەتی گەورە دەکات، چونکە بە ئاشکرا پەیمانەکەیان هەڵنەوەشاندووەتەوە، پاداشتی هەموو خیانەتێکی گەورەش لە سەرجەم دەستوورەکانی ئەوکاتەدا کوشتن بوو، حەزرەت بڕیاری کوشتنی کەعب دەدات، بۆ ئەو

---

[1] السیرة النبویة، د. علي محمد محمد الصلابي، ص14-15، ج2.
[2] السیرة النبویة، د. علي محمد محمد الصلابي، ج2، ص15.
[3] السیرة النبویة، د. علي محمد محمد الصلابي، ج2، السیرة النبویة، ابن هشام ج2، تأریخ الطبري، ابن جریر الطبري ج2، البدایة والنهایة، ابن کثیر، ج3-4.
[4] السیرة النبویة، د. علي محمد محمد الصلابي، ج3-4.
[5] السیرة النبویة، د. علي محمد محمود الصلابي، ج2، ص56.

مەبەستەش موحەممەدی کوڕی مەسلەمە (نووسەر هەڵەی کردووە نووسیویەتی موسلیم) وەك خۆبەخش بەرکارە هەڵدەستێ، بەڵگەش بۆ ئەوەی کە خیانەتی گەورەیە هۆزی بەنی نضیر، بەهیچ شێوەیەك لەسەری نایەنە وەڵام و قسەی لەسەر ناکەن، هۆکەشی، یەکەمیان، لەبەرئەوەی دەزانن خیانەتی گەورەی کردووەو دووەمیان لەبەرئەوەی لە هۆزی بەنی نضیر نییە، نووسەر وەك بوختانێك پەرەگرافەکەی پڕ کردووە لە درۆ، کە گوایە کەعب لە بەر دڵداریی لەگەڵ ژنانی مسوڵمان –کە هیچ بەڵگەیەکی نییە– مێژوونووسان باسی شیعر دەکەن کە بە ئافرەتانی مسوڵماندا دەیوت.

***دووەم:*** پ3، لا(136) دێڕی (1–6) "...سەلامی کوڕی ابی الحقیق لە دۆستانی عەشیرەتی ئوس بوو، عەشیرەتی خەزرەج ئیجازەیان لە موحەممەد خواست تا ناوبراو، کە لەناودارانی یەهودو هاوپەیمانی ئوس بوو، بکوژن، پێغەمبەر ڕێگەی داو (عبداللە کوڕی عەتیك)ی کردە سەرکردەیان...".

نوسەر وا ئاماژە دەکات کە ئەم کەسە هەروا لە خۆوە عەشیرەتی خەزرەج، پاش ئیجازە وەرگرتنیان لە حەزرەت بیکوژن، هۆی چییە؟ نایڵێت، بۆ ئەوەی شتەکە بە شاراوەیی و لێڵی بمێنێتەوە.

سەلامی بن أبی الحقیق ناسراو بوو بە أبو رافع، لە هۆزی بنی نضیر، لە دوای شەڕی خەندەق و بەتایبەتی دوای لێدانی بنی قریظة یەکێك بوو لەو کەسانەی کە عەرەبەکانیان هاندەدا بۆ هێرشکردنە سەر مەدینەو لە ناویاندا هاندەری سەرەکی هۆزی غطفان و چواردەورەکەی بوو بۆ جەنگی ئەحزاب (خندق)، ئەم کارەی أبو رافع لە ناو خەڵکدا دەنگیدایەوە، هەربۆیە خەزرەج لە کێبەرکێی ئەوسدا، بۆ ئەوەی ئەم عەشیرەتەش چالاکیی خۆی هەبێت لە لە ناوبردنی دوژمنانی ئیسلامدا، داوایان کرد لە حەزرەت کە ڕێیان پێبدات أبو رافع بکوژن، حەزرەتیش لەبەرئەوەی ئەم یەهودیە خیانەتی گەورەی دەرهەق بە پەیمان ئەنجام دابوو، بڕیاری کوشتنی داو لە سەر دەستی چەند کەسێکی حەزرەجیی بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵای کوڕی عتیك کارەکە بە ئەنجام گەیشت، کە ئەنجامی هەموو خیانەت و پاشقول گرتنێك بە کوشتن کۆتایی دێت.[1]

***سێیەم:*** پ4، لا(136) دێڕی (2) "کوشتنی بصری کوڕی برزام ئەویش لەبەرئەوەی کە لەناو تایەفەی بەنی غطفاندا خەڵکی بۆ شەڕ لە دژی موحەممەد هاندەدا".

پ4، لا(136)، دێڕی (3) "خالدی کوڕی سوفیان کە لە (نخلە) خەڵکی لە دژی موحەممەد هاندەدا".

نووسەر ئەم دوو هەواڵەی لەیەك پەرەگرافدا کۆکردووەتەوە، هۆکاری کوشتنەکەی دیاری کردووە، کە تاوانی خیانەتی گەورەیە، بەڵام ناوی یەکەمی بەهەڵە نەقڵ کردووە، کە یسیری کوڕی رزام یەهودیە، بەدەستی عەبدوڵڵای کوڕی رواحە کوژرا کە ماڵەکەی لە خەیبەردا بوو، ئەم هەواڵانەش، کە دەنگ و باسی بڵاوبوویەوە، حەزرەت جاری یەکەم عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی نارد بۆ دڵنیابوون لە هەواڵەکە، یەکەمیان کۆکردنەوەی جولەکەکانی بەشی سەرووی خەیبەر بوو، دووەمیان هاندانی هۆزەکانی غطفان لە دژی حەزرەت، پاش دڵنیابوون لە ڕاستیی هەواڵەکە، حەزرەت بڕیاری کوشتنی یسیر کوڕی رزامی دا.

سەبارەت بەکەسی دووەم، عەبدوڵڵای کوڕی ئەنەس دەیگێڕێتەوە کە دەڵێت "حەزرەت بانگی کردم و فەرمووی بیستوومە کە خالیدی کوڕی سوفیانی کوڕی نبیح الهزلی خەڵکم لە دژ کۆدەکاتەوە بۆ جەنگ، ئەرکی تۆش ئەوەیە لە ناوی بەری، پاشان وتم: وەسفی بکە بۆم ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی: پیاوێکە ئەوەندە کەڵەگەتە. وەختێك دەیبینی مووەکانی لە شت ڕاست دەبنەوە، عەبدوڵڵا دەڵێت: کە بینیم ئەو حاڵەتەم بەسەردا هات، پەلامارمداو شمشێرم لێهەڵکێشاو زاڵ بووم بەسەریداو کوشتم.[2]

---

[1] السیرة النبویة، د. علي الصلابي، ج2، ص338. البدایة والنهایة، ابن کثیر م2، ج3–4، ص154.

[2] السیرة النبویة، ابن هشام، ج2، ص618، السیرة النبویة، د.علي محمد محمود الصلابي، ج2، ص243.
البدایة والنهایة، ابن کثیر، ج3–4، ص154.

## پێغەمبەرایەتی و حوکمڕانی

پ3، لا139، دێڕی 1-4 "....دەگێڕنەوە کاتێك کە یەکێك لە ناودارانی یەهود بەناوی (عبدالله کوری سلام) بوو بە مسوڵمان یەهودیەکان پێیان گوت: تۆ خۆت باش دەزانیت کە پێغەمبەرایەتی لە ناو بەنی ئیسرائیل دایە، نەك لە ناو عەرەبدا، ئاغای نوێت پێغەمبەر نییە، بەڵکو پاشایە".

نووسەر قسەکانی زۆر لە حیکایەتخوان دەچێت، سەرەتا عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ناوی ئەسڵی (حصین بن سلام)ە، خۆی دەیگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: "ناوی حەزرەتم بیستبوو، ناسیبووم و سیفەت و ناوی ئەوکاتەی کە دێت دەمزانی، بەڵام بێدەنگیم لێکردبوو هەتا حەزرەت هات بۆ مەدینە، کە هەواڵم بیست لە ناو باخێکی دارخورمای خۆم بووم، کە دەنگو باسەکەم بیست، (ألله أکبر)م کرد، پورم کە لەوکاتەدا لەگەڵم بوو، زۆری پێ سەیر بوو وتی: ئەگەر هەواڵی موسات ببیستایە هەروات بۆ دەکرد، وتم: بەڵێ، چونکە برای موسایەو لە سەر دینی ئەوە، چووم بۆلای و مسوڵمانییەتی خۆمم ڕاگەیاند، بەڵام وتم ئەی پێغەمبەر (ﷺ) من لە ناو یەهوددا شوێن و مەکانەتێکم هەیە، حەزدەکەم پێش مسوڵمان بوونم بزانن، لێیان بپرسی لەبارەی منەوە، چونکە یەهود بوختان چین، حەزرەت ناردی و هاتن و منیش لە مالێکدا خۆم پەنادا، کە حەزرەت لێی پرسین، ئەو پیاوە چۆنە؟ وتیان: زانامانەو گەورەمانەو کوڕی پیاوی گەورەیە، پاشان هاتمە دەرەوەو خۆم ئاشکرا کردو بە ئاشکرا شایەتیمدا بە نێردراوی حەزرەت و یەکتایی خواو هەندێ ئامۆژگاری یەهودییەکانم کرد، کەوتنە قسەوتن وتیان: شەڕترین کەسەو کوڕی پیاوێکی زۆر خراپە، تاوانباریان کردم بەدرۆ، پاشان ماڵ و منداڵەکەشم لەگەڵ پورم مسوڵمانییەتی خۆمان ڕاگەیاند[1].

ئەمە ئەو سەرگوزشتەیە لە کتێبەکانی مێژووی ئیسلامدا هەیە سەبارەت بە مسوڵمان بوونی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، پاشان لە کاتی موناقەشەدا جارێکیان (حي بن أخطب وكعب بن أسد، أو رافع وأسيع وشمويل بن زيد) لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەپرسن، پێغەمبەرایەتی لە عەرەب نابێت، ئەم هاوڕێیەی تۆ مەلیکە، بەپێی شێوەکەی دەردەکەوێت کە ئەمە پاش ماوەیەك بووە[2].

## کۆتایی

هەموو کارێکی نووسین بەبڕوای من، پاش وەختێکی دیاریکراو ئەگەر نووسەرەکەی بیخوێنێتەوە، لەسەر هەندێکی سەرنجی بۆ دروست دەبێت، بۆیە منیش لەوانەیە لە سەر ئەم نووسینەم سەرنجم بۆ دروست بێت لە ڕۆژگارێکدا، بەڵام لە هەمانکاتدا زۆرم هەوڵداوە عاتیفە بخەمە لاوە، بەهەموو توانایەکم مەنتیقی و مەعقول بنووسم، گومانیشی تێدا نییە ئەم نووسینە لە هەڵە بەدوور نییەو کەموکوڕیی تێدایە، من ئەوەندەم توانیوە دەکرێتدەست خۆشی لە وکەسانە بکەم پڕ بەدڵ کە هەڵەکانم بۆ چاك دەکەنەوە، لە هەمانکاتدا داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر بەناحەق ئازاری دڵی کەسم دابێت و بە دڵنیاییەوە مەبەستم نەبووە، تەنها ئەوەندە هەیە هەوڵم داوە قسەکانی نووسەرو وەرگێڕ وەك خۆیان وەڵام بدەمەوە، چونکە تەنها مەبەستم ئەوەیە کە ڕاستییەکان بزانرێت، ئامادەشم ئەگەر هەر هەڵەیەك هەبوو بەپێی دیکۆمێنتەکان، بە نووسین بڵاوی بکەمەوە.

نووسینەکەش زۆری لە خۆگرتبوو، من تائێرەی وەڵام دەدەمەوە، چونکە بەبڕوای من نووسەر سەرکەوتوو نەبوو لە ناوی کتێبەکە، چونکە هەندێ بابەت باس دەکات پەیوەندی بە ماددەکەوە نییە، هەندێکی تری بابەتەکان بەهیوام لە کتێبێکی تایبەتدا لە سەری بنووسم، بەتایبەت کێشەی ئافرەت، ئەو بابەتانەی کە زانیاریم نەبووە، یان دەستم نەکەوتووە

[1] السيرة النبوية، ابن هشام، ج2، ص516، البداية والنهاية، ابن كثير، م2، ج2,3، ص222.
[2] السيرة النبوية، ابن هشام، ج2، ص571.

خۆم لێنەداوە، چونکە لێم نەزانیوە، هەوڵ دەدەم بپرسم، یان بخوێنمەوە، بۆ ئەوەی زیاتر شارەزا ببم، تا قسەیان لە سە بکەم، بەو هیوایەی کتێبخانەی کوردیم دەوڵەمەند کردبێت لە ڕای جیاواز، چونکە ڕای جیاواز مانای تەندروستیی گەلانە، بەمەرجێك زانستیی و ئەکادیمیی بێت نەك، تڕۆهات و درۆ هەڵبەستن، هەربۆیە ئەو بابەتانەی کە ماون قسەم لە سەر نەکردوون سەرجەم ڕەخنەکانم نووسیوە، ئامادەم کردوون، بەڵام بڵاوکردنەوەیانم بە پێویست نەزانی.

## پاشکۆ

پاش ئەوەی ئەو ئەندازەیەی کە بڕیارم دابوو لە سەر کتێبی (23 ساڵ پێغەمبەرایەتی) بنووسم، لە کاتی دیاریکراودا تەواوم کردو خستمە بەردەستی بەڕێزان لە پڕۆژەی (تیشك)، ئەوانیش لای خۆیانەوە سپاردیان بە بەڕێز دکتۆر صەباح بەرزنجی بۆ هەڵسەنگاندنی نووسینەکە، بەڕێزیشیان پێش ئەوەی دەست بکات بە هەڵسەنگاندنی، لە دیڕێکدا ئەوەیان پێشنیارکرد کە ئەسڵی ئەو کتێبە لە لایەن کە سێکی دیکەوە وەڵامدراوەتەوە لە سێ بەرگدا، بەڵام بەزمانی فارسی، پێم باشە دووبارە چاوێك بەنووسینەکەتدا بخشێنیتەوەو بەراوردێکی بکەیت لەگەڵ وەڵامەکانی ئەودا، منیش زۆرم پێخۆش بوو کە نووسینەکەم ئەگەر بەهێز بێت ئەوا ئەم نووسینە بەهێزتری دەکات، ئەگەر نووسینەکەشم لاواز بێت ئەوا بەهێز دەبێت، کە سەیرم کرد دەبینم نووسینەکان لە هەندێ ڕووەوە لە یەکدەچن و لە هەندێکی دیکەدا جیاوازن، بۆیە پێم باش بوو وەك پاشکۆیەك خاڵەکانی ئەم نووسینە تازەیە بخەمە بەردەست، هەر بۆیە هەرخاڵێکی ئەم نووسینە تازە کە لەژێر ناونیشانی (خیانەت لە هەواڵەکانی مێژوو) لە نووسینی (مصطفی حسینی طباطبائي) بەجیا تۆماربکەم و بێتە زیادەیەکی تەواوکەر بۆ نووسینەکەی خۆم، ئەم کارەی من وەرگێڕان نییە تا پابەندبم بە شێوازی وەرگێڕانەوە، نووسین لەسەریش نییە، تا پابەندبم و پەرەگرافەکانی دیاریی بکەم، بەڵکو ئاماژەیەکی هەڵهێنجراوە لە هەردوو بابەتی وەرگێڕان و نووسین لەسەر.

## ناوەڕۆك